# باڵاپۆشی

## ڕێگەیەك بۆ سەرکەوتن

ئامادەکردنی:

مەسرور سلێمان



ناوی کتێب: باڵاپۆشی... ڕێگایەک بۆ سەرکەوتن .

ئامادەکردنی: مەسرور سلێمان عەزیز(مەسرور دوکانی)

پێداچوونەوەی : م . ناصح محمد شارباژێڕی

نۆبەی چاپ: شەشەم .

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ زاینی - ١٤٤٢ کۆچی.

تیراژ: ١٠٠٠دانە.

ژمارەی سپاردن (١٦٣٤)ی ساڵی ٢٠٠٩زاینی .

دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن





# پێڕست

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایان و بێ ژمارە و بێ سنووردار بۆ خودا، بە ژمارەی دروستراوەکانی و بە ئەندازەی ڕەزامەندی خۆی و بە سەنگ و قورسایی عەرشەکەی و ڕێژەی مەرەکەبی وشکانی و پێوانەی زەوی و ئاسمان و دڵۆپەی باران، سەلات و سەلامیش لە سەر پێغەمبەری سەرداری پێغەمبەران ﴿ﷺ﴾.

خزمەتکردنی دینی ئیسلام ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکی دڵسۆزە بە پێی توانا، داوا لە خواش دەکەم ئێمەش بکاتە خزمەتکار و هەڵگری ئاڵاو بانگەوازی ئەم دینە پیرۆزە کە، مایەی سەربەرزی و ڕزگاری دونیاو دوارۆژی ئێمە و هەموو ئاڵا هەڵگرانی و تەواوی مرۆڤایەتییە .

نووسینی ئەم نامیلکەیەش لە مەیدانی شەرم و شکۆدا کە، بەشێکە لە بڕوای بڕواداران و دینی دینداران و ئیسلام پەروەران لە خوا دەخوازم خشتێکی زێڕین بێت لە کۆشک و باڵخانەی بانگەوازی ئیسلامی لە کوردستاندا .

بە کاک مەسروریش دەڵێم دەستت خۆش بێت، خامەت ڕنگین و کوڵت سەنگین، خوا لێت وەرگرێت و بەرهەمی چاکتر و بە کەلکتر و بە پێزتری بە دوادا بێت، هەر ماندوو نەناس و پشوو درێژ بیت بۆ خزمەتی ڕابوونی ئیسلامی، لە خوا داوا دەکەم ئاڵای ئیسلام بە ئێمە بەرز و شکۆدار بکات ئێمەش بەم پەیامە پیرۆزە سەربەرز و پایەدار بکات .

و السلام علیکم و رحمە اللە و برکاتە

مەلا ئەحمەدی شەریعە



تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون " یوسڕا عمر "**

**کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

## دەستپێك:

بۆ خوشكى ئازیزم ئەى دووڕومەرجانى پارێزراو، ئەى گوڵى پشكوتو، ئەى گوڵى لیكراوەى پاك، ئەى نێو نەمامى ژیان، ئەى گوڵى كۆمەڵگا، ئەى تاجى سەرى میللەت، ئەى خوشكى بەڕێزى موسڵمانم، بۆ تۆم نوسیوە ئەم ووشانە بە مەرەكەبێك لەخوێنم لەسەر پەڕەى دڵم وە بەخۆشەویستى و دڵسۆزیم پێچاومەتەوە و بەڕاستگۆى و وەفاوە پێشكەشتى دەكەم، بۆ تۆم كۆكردۆتەوە ئەى پێشرەوى نەوەكان، ئەى پەروەردەكەرى قارەمان، دەتۆش جوان بیخوێنەرەوە و گوێى بۆبگرە و دڵتى بۆ بكەرەوە و مێشكتى بۆبخە كار و لێمى وەربگرە، خوشكەكەم ئەى ئەو كەسەى ناوى ((لا اله الا الله)) ت هێناوەو ((محمد رسول الله )) ت لەگەڵ بردووە و باوەڕت پێهێناوە دینەكەت تەواو بكە بە باڵاپۆشینەكەت، باڵاپۆشى و نوێژ لێك جیامەكەوە یان بڵێى هەرشتەو بۆخۆى، خواى گەورە لێكى جیانەكردوونەتەوە هەردووكى فەرز كردووە، خوشكى ئازیزم سەیرى مرۆڤە خراپەكان مەكە هیچت بۆ

زیادناکەن گوناهو تاوان نەبێ هەروەها شەرمەزارو عەیبدارت ئەکەن لەدونیاو ئاخیرەت دا، خوانەخواستە من نامەوێ خوشکان بریندار بکەم و دڵیان زویر بکەم بەڵکو ئەمەوێ جەخت لەسەر شەرمی ئافرەتان بکەمەوە لەبەر ئەوەی گرنگترین جۆری شەرمە، نەیارانی دین ئەیانەوێ گێرەشێوێنی بنێنەوە، هەوڵدەدەن شەرمی ئافرەت نەهێڵن چونکە ئەوە زایە بوونی لاوان ئاسان دەکات، ئەگەر بڵێین شەرم بۆ پیاو شتێکی پێویستە ئەوا بۆ ئافرەت زۆر پێویسترە و سروشتی ئافرەت لەشەرمەوە نزیکترە و پێی خۆشترە، گەورەترین شەرمی ئافرەتیش ئەوەیە جەستەی داپۆشێت.

من لێرەدا پرسیارێکم هەیە: ئەگەر شتێکی زۆر بەنرخت هەبێت بۆ نموونە ئەگەر مرواریەکت هەبێت ئایا لە شوێنێکی شیاو دەیپارێزی یان نا؟ ئەی ئەگەر شتەکە بەنرختربێت دەیخەیتە بەردیدەی خەڵکی یان باشتر دەیپارێزیت؟ ئەی گرنگترین شتی ئافرەت چی یە؟ ئایا شەرم و شکوکەی نی یە؟ ئەی ئەمە شایەنی ئەوە نییە پارێزگاری لێبکرێت؟ ئەوە نیە گوێچکە ماسی مرواری هەڵدەگرێت بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بێئەوەی لەسەرەتادا هیچ سودێکی هەبێت بەڵام ئەم پاراستن و هەڵگرتنە پێ◻ویستە بۆدروستکردنی مرواری، هەروا باڵاپۆشیش پێویستە بۆپاراستنی تۆ .

لێرەدا پرسیارێک سەر هەڵدەدا بۆچی باڵاپۆشی لەسەر ئافرەت فەرز کراوە ولەسەر پیاو فەرز نەکراوە؟ ئایا ئەمە بۆ بەر تەسککردنەوەی ئازادی ئافرەتە؟ یان چی؟ لەوەڵامدا

دەڵێین: سەد پیاو ناتوانن یەک ئافرەت هۆگری خۆیان بکەن و هەڵیخەڵەتێنن گەر خۆی نەیەوێت بەڵام تاکە ئافرەتێک دەتوانی سەد پیاو هۆگری خۆی بکات هەر لەبەر ئەمەیە بالاپۆشی (حیجاب) بەسەر ئافرەتدا فەرزکراوە چونکە سەرچاوەی کاریگەرییە.

ئەوە حیجابە و لە ئاسمانەوە فەرمانی پێکراوە، لە ئاسمانەوە دابەزیوە سمبولی فەخر و شانازی هەموو کچە موسڵمانێکە، فەرمانی ئەو ئیسلامەیە کە سنوری ئەم وولات و ئەو وولات نایگۆڕێت، لەکاتی پێش ئیسلام بەچاوێکی بێزراو ئەیانڕوانیە ئافرەت بەڵام ئیسلام هات نرخێکی گەورەی بەئافرەت بەخشی تا پیاو فێر بکات کە، بەهای ئافرەت لەجەستەیدا نییە بەڵکو لەجوانی عەقڵ و بیر و هۆشیدایە، لەجوانی ناوەڕۆکیدایە، کەواتە دیارە کێ ڕێزی لەئافرەت ناوە و، کێش لەشان و شکۆی کەمکردۆتەوە، جا بۆیە خوشکەکەم یەکێک لەهەرە گەورەترین شەرم و حەیای ئافرەت لای خوای گەورە حیجابەکەیەتی، ئەگەر تۆ ئافرەتێکی بەشەرم بی لای خوای گەورە دەبێت بەحیجابەکەت بیسەلمێنی کەشەرم دەکەی، حیجابیش واتە خۆ پۆشتەکردن، واتە داپۆشینی بەرزو نزمی ئافرەت، واتە دەرنەکەوتنی جەستەی ئافرەت

هەروەکو خوشکێکی موسڵمان کەناوی (غەمگین کوساریيە) لە شعرێکدا دەڵێت:

حیجاب کارێکی جوانە
بەرگی بەری خوشکانە
ئافرەت حیجاب کە بێدەنگ
گەر پیری یا شۆخ و شەنگ
حیجاب یانی داپۆشراو
نەک بەرگێکی دیاری کراو
بەرگی کوردی ئافرەتان
یادگاری پێشینان
بەمەرجێ تەنگ نەبێ
دەرخەری لاشەت نەبێ
لای من بەرگێکی جوانە
پیرۆز بێت لەوخوشکانە
کە شەرعیە کالایان
ئەپۆشن گشت بالایان
ئێمەین ئافرەتی کوردین
موسڵمانین کار ووردین
خۆناکەینە پێشانگا
بۆ چلێس و بێ ئاگا

لێرەدا دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە زۆر لە خوشکانی مسوڵمان لەمێشکیاندا هەیە ئەویش ئەوەیە ئایا باڵاپۆشی فەرزە یان سونەتە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: باڵاپۆشی فەرزە و لەلایەن خواوە فەرز کراوە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەشمان دەبێ بیسەلمێنین کە فەرزە ئەویش بەو ئایەتەی کە خوای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی الاحزاب دا لە ئایەتی (٥٩) دا ئەفەرموێت:

{ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا } [الأحزاب ٥٩]

((ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی بڕوادار بە پۆشاکی باڵاپۆش خۆیان دابپۆشن بۆ ئەوەی بناسرێن و ئازارنەدرێن)) خوای گەورە لەئایەتەکەدا دەفەرموێت (فلايؤذين) واتە (بۆ ئەوەی ئازار نەدرێن) با ووردبینەوە و لەم ووشەیە تێ بگەین یانی چی بۆ ئەوەی ئازار نەدرێن؟ لە وەڵامدا دەڵێین: خوشکی بەڕێزم بیر بکەرەوە کاتێک ئافرەتێک بەجلێکی بێ شەرعییەوە کە لاشەی دەربخات دەڕواتە دەرەوە، کاتێک کە بە لای کومەڵێک لە کەسی نەفامدا تێدەپەڕێت چەندەها تانە و تەشەر و تەعلیق و وتەی پڕ و پوچ بەو ئافرەتە دەوترێت، ئا لەم کاتەشدا ئافرەتەکە هەستی بریندار دەبێت و خەفەتی پێدەخوات و ئازار دەچێژێت، ئالێرەدا بۆت دەردەکەوێت کە ووشەی (فلايؤذين) واتە (بۆئەوەی ئازار نەدرێن) بۆ قازانجی تۆیە جا بۆئەوەی هەستت بریندار

نەکرێیت و تانەو تەشەرەت لێنەدرێت و ئازار نە چێژیت خۆت پۆشتە بکە.

خوشکی ئازیزم لێرەدا ئەوەت پێدەڵێم: باشە ئەگەر شتێک زۆر گرنگ نەبێت بە ووشەی خوای گەورە فەرز دەبێت؟ لەبەرئەوە دەبێت بالاّ پۆشیت زۆر لا خۆشەویست بێت چونکە جێبەجێ کردنی ئەمرێکە کە لە عەرشی خوای گەورەوە دابەزیوەتە سەر زەوی.

ئەی خوشکی مسوڵمانم ئایا دەزانی فەرمانی کێت بە لاوە ناوە؟ ئایا دەزانی سەرپێچی لە فەرمانی کێ دەکەیت؟ لە فەرمانی زاتێک دەرچوویت کە گشت نیعمەتێکی بەسەردا باراندوی، خوشکەکەم ئەگەر پرسیارێکت لێبکەن و بڵێن: خۆشەویستی تۆ کێ یەو دوژمنت کێ یە؟

لەوەلامدا دەڵێیت:خوام خوشدەوێ و شەیتانیش دوژمنمە بەلام بە داخەوە وەلامی پرسیارەکەت لە جەستەتدا ڕەنگ ناداتەوە بە زمان دەڵێی: خوام خۆشدەوێ کەچی بەکردار نایسەلمێنی، کارێک دەکەی کەخودا خۆشی ناوێ لەم کاتەشدا دەبێتە (وەستای قسان و کۆلەواری دەستان ) هەربۆیە شەیتان ووتویەتی: سەرم لە بەنی ئادەم سورِ دەمێنی خوایان خۆش دەوێت کە چی سەرپێچی فەرمانەکانیشی دەکەن ڕقیان لە منەو لە فەرمانەکانیشم دەرناچن.

خوشکی بەڕێزم گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە بگرە کە ئافرەتێکی ئەمریکییە باسی بەسەرهاتێکی خۆی دەکات،

ئافرەتەکە مسوڵمان دەبێت لە ناو زانکۆیەکی ئەمریکایە لە کالیفۆرنیا، دەڵێت کە، من کاتێ حیجابم پۆشی یەکەم کەس بوم لەناو ئەو زانکۆیە کە حیجاب پۆشبم، دەڵێ چەند مامۆستای کاسۆلیک هەبوون ویستیان چەند کێشەیەکم لەسەر دروستکەن نمرەیان لێ شکاندم، لە چەند دەرس دەریان نەچاندم، هەتا وای لێهات کێشەکە گەیشتە دادگا، لە زانکۆ لیژنەیان دانا بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ئەو مەوزوعە، ئافرەتەکە شکاتی لەو مامۆستایانە کرد کە دڵنیا بوو لەسەر حیجابەکەی وایلێدەکەن قەزیەکە لە دادگا ڕوون بووە و دەرکەوت کە ئەو مامۆستایانە لەسەر حیجابەکەی وایلێدەکەن، ئەویش تەنازولی نەکرد، دەڵێ لەو کاتەدا کە دانیشتبوو ئەو ئافرەتە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەریشی بکەن لەزانکۆ حیجابەکەی فڕێ نادات، ووتی چونکە ئەمریکی خوایە شەرم لە هیچ کەسێک ناکەم دوایی قەزیکە کە تەواوبوو لە بەرژەوەندی ئافرەتەکە تەواو بوو چوار مامۆستا و چەندین تەلەبەی تر لەسەر دەستی ئەو ئافرەتە مسوڵمان بوون بەس لەبەرئەوەی حیجابەکەی فڕێ نەدا

سەیرکە خوشکی ئازیزم ئەو ئافرەتە چەند سووربوو لەسەر حیجابەکەی، چونکە ئەزانێت فەرمانی کێی جێ بەجێ کردووە، ئەزانێت پۆشینی حیجاب لەبەرژەوەنی خۆیدایە..... لەبەرئەوەی فەرمانی خودای بەلاوەنەنا و تەنازولی نەکرد خوای گەورەش پشتی گرت و سەری خست.

بەڵێ خوشکی بەڕێزم بالاپۆشی ژیانێکی پڕ ئاسودەیی و بەختەوەریت پێ دەبەخشێت، ژیانێکی وات پێ دەبەخشێت کەلەدونیا سەرکەوت و سەرفراز بیت لەقیامەتیش ڕەزا بوونی پەروەردگار بەدەست بهێنیت و بەهەشت جێگەت بێت.

وریابە خوشکەکەم بزانە پۆشینی حیجاب چەند گەورەیە و نەپۆشینیشی چەند تاوانێکی گەورەیە دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی ئەگەر نوێژبکەیت بەلایەنی زۆرەوە پێنج دەقیقە بەنوێژەکەوە دەبیت ئەگەر بەڕۆژووش بیت لەبانگی بەیانیەوە تا بانگی ئێوارەیە ماوەکەی، وە ئەگەر سەفەری حەجیش بکەیت ئەوپەڕی مانگێکە ماوەکەی، ئەم ئەرکانە هەمووی فەرزن پاداشتەکەشیان گەورەیە لەلای خودا بەڵام ماوەکەیان کەمە لە چاو حیجابەوە، چونکە تۆ ئەگەر حیجاب بپۆشی نەپێنج دەقیقەیە و نە لە بانگی بەیانییەوە تابانگی ئێوارەیە و نەمانگێکیشە، بەڵکو حیجابەکە تۆ بەردەوام پۆشیوتە لەبەرئەوە بەدرێژایی پۆشینی حیجاب خێر و عیبادەتت بۆ دەنوسرێ، بەڵام ئەگەر حیجاب نەپۆشی مەلائیکەتی سەر شانی چەپت بەردەوام لەنوسینی گوناهدایە بۆ تۆ لەبەرئەوەی بەردەوام لەبێ فەرمانی خوای گەورەدای[1]، ئەو هەموو گوناهەت بۆ نوسراوە بەبێ ئەوەی هەستت پێ کردبێ و گوێت پێدابێت و ڕۆژێک لەڕۆژان بیرت لێکردبێتەوە.

لەسەردەمی نەفامی یەکەمدا خۆ دەرخستن بەلەبەرکردنی تەنوورەی کورتی تەسکی فەتحە دار یان بۆدی و پانتۆڵی تەسک نەبوو نا... نەخێر بەڵکو جلی درێژو فراوانیان لەبەر دەکرد

---

(١) کاتێک دەڵێین بەردەوام لە بێفەرمانی خوای گەورەدای ، مەبەستمان ئەو کاتانەیە کە دەڕۆیتە دەرەوە لە ماڵ یان لە بەرامبەر پیاوی نامەحرەمدا

بەڵام مل و قژیان دەردەخست ئەمە خۆ دەرخستنی نەفامی یەکەم بوو، هەروەکو ئەو حیجابە ناتەواوانەی کە ئەمڕۆهەندی لەخوشکان لەبەری دەکەن، بەداخەوە زۆر خوشکی مسولمان هەیە بە حسابی خۆی حیجابی پۆشیوە، بەڵام زۆرێک لەقژی بەدەرەوەیە یان سنگی دانەپۆشیوە یان قوڵی دانەپۆشیوە یان قاچی دانە پۆشیوە، من نامەوێ ئەو خوشکانە توڕەبکەم، بەڵام کارەکە پەیوەستە بەشەرمی تۆ و فەرمانی خودا، پەیوەستە بەوەی کە چۆن دەوەستی لە بەرامبەریدا لە ڕۆژی دوایدا، لە پۆشاکەکەت پرسیارت لێدەکات، بەڵکو من پێشم خۆشە کەهەنگاوی یەکەمیان ناوە ئەمەوێت هەنگاوی گەورەتر هەڵگرن تاحیجابەکەیان تەواو دەبێت و سنگ و گەردن و هەموو لاشەیان داپۆشێت، لەئیسلامدا ڕێزی ئافرەت هێندە بەرزە کە لە پێناوی ئەودا چەندەها شەڕ بەرپابووە، چەندەها کەللەسەریان لەپێناوی یەک ئافرەتدا تێک و پێک شکاندووە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جەنگێکی گەورەی بەرپاکرد لەسەر ئافرەتێک کە گیانی دەرکەوت کەجەنگی (بەنوقینوقاع) بوو، جولەکەکانی (بەنوقینوقاع ) لەمەدینەدا دەژیان و بازاڕێکی ئاڵتونیان هەبوو ڕۆژێکیان ئافرەتێکی موسوڵمان چووە ئەو بازاڕە بۆ شت کڕین جولەکەیەکی پیس لای خواروی کراسەکەی بەست بەسەریەوە کاتێک ئافرەتەکە هەستا گیانی بەدەرکەوت جولەکەکان پێی پێکەنین یەکێک لەهاوەڵەکانی پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ هاتوو جولەکەکەی کوشت، جولەکەکانیش هاوەڵەکەیان شەهید کرد پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ بەسوپایەکەوە چووە سەر هۆزی (بەنو قینو قاع) و گەمارۆیدان و لەمەدینە دەری کردن ئەوانیش پەرتەوازە

بوون و مردن، هەموو ئەمانە لەپێناو ئافرەتێکدا بوو کە گیانی دەرکەوت ئەی ئەگەرپێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵە بەڕێزەکان پاش ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبونە حاڵی ئێمەیان ببینیایە چییان ئەکرد؟ ئەی ئێمە چییان پێ بڵێین لەڕۆژی دوایی؟ توخوا بەڕای تۆ دەبێت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ چی بکات کاتێک بارودۆخمان ئاوا ببینێت؟ یان دەبێت چی بفەرموویێت؟ زۆر بەکوڵ دەگریت ..... دەگریت و بەڕووی من و تۆدا دەفەرموویێت: بۆ گەیاندنی ئەم دینە بە کەسانێکی وەکو ئێوە من ژیانی خۆم تەرخان کرد بۆ گەیاندنی ئەم پەیامە، دەربەدەری و چەرمەسەری زۆرم چەشت، لەشاری (مەککە)ی خۆشەویست وە دەریان نام ، لە شاری (طائیف) بەردبارانیان کردم خوێن بەسەرمدا دەهاتە خوار هەتا گەیشتە بنی پێم، (سێ)ساڵ لە شیوی (ابوطالیب) ئابلۆقەدراین، هاوەڵانم ماڵ و سامانیان لەو پێناوەدا دانا، گۆشت و خوێنیان تێکەڵ بەم خاک و خۆڵە کرد، ئێوە خۆتان بە ئومەتی من دەزانن؟؟ بۆ کەسانێکی وەکو ئێوە تا ئایینتان پێبگات گۆڕی هاوەڵەکانم لە پارچەکانی سەر زەوی پەرش و بڵاو بوونەتەوە، ئێوەن کە وامزانی لە دوای مندا ئەم ئایینە هەڵدەگرن و دەیگەیەننە کەسانی تر، چۆن لە بارەگای پەروەردگار شەفاعەتتان بۆ بکەم کە ئێوە بەم شێوەیەن؟؟ چۆن لە ڕۆژی دوایی لە حەوزی (کەوسەر) ئاوتان پێ بدەم کاتێک کە ڕێباز و سونەتی منتان وازلێهێناوە و بەجێتان هێشتووە.

پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) جارێک بەڕێگادا دەڕۆیشت و لەپێشییەوە ئافرەتێک حیجابەکەی با هەڵیدایەوە پاژنەی دەرکەوت پێشەوا بینی بۆیە بەجلەکانی دەم و چاوی داپۆشی و بەتوڕییەوە ووتی (ئەمە سەردەمی فیتنەیە ) ئەی ئەگەر لەم سەردەمە دا بویتایە چیت ئەوت ئەی پێشەوا؟

کەواتە ڕێکو پێکبونی حیجابی ئافرەت تێرو تەواو بوونی شەرمیتی ئەگەر ئافرەتانیش بەشەرم بوون، کۆمەڵگە ڕێکوپێک دەبێت ئیمان تەواو دەبێت. پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:

(الحياء والإيمان قرنا جميعا اذا رفع احدهما رفعَ الاخر)[1][(1)].واتە: (شەرم و باوەڕ پێکەوە جووتین کەیەکیان نەما ئەوی تریشیان نامێنێت) .

وریابە خوشکی ئازیزم، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:

(صنفان مِن أهل النار لم اراهما قوم معهم كأذناب البقرة يضربون بها الناس،ونساء كاسيات عاريات مميلات مائيلات رؤوسهن كأسنمة البخت المائلة لايدخل الجنة ويجدن ريحها وان ريحها بيوجد من مسيرة كذا وكذا)[2].

واتە: دووکۆمەڵ لەئاگردان من نەم بینیون کۆمەڵێکیان قامچیان پێیە و وەک کلکی مانگا وایەو لەخەڵکی پێدەدەن. وە

---

١ (رواه البخاري في الأدب المفرد باب الحياء رقم ١٣١٣ وأخرجه أبو نعيم فى الحلية (٢٩٧/٤)، والحاكم (٧٣/١، رقم ٥٨) وقال: صحيح على شرطهما . والبيهقى فى شعب الإيمان (١٤٠/٦، رقم ٧٧٢٧) وأخرجه أيضًا: ابن أبى شيبة (١٦٥/٦، رقم ٣٠٣٧٢) موقوفًا وقال شيخ الألباني صحيح .

٢ ( أخرجه مسلم ( ٨ / ١٥٥ ) و البيهقي ( ٢ / ٢٣٤ ) و أحمد ( ٢ / ٣٥٥ - ٣٥٦ و ٤٤٠ )

ئافرەتانێک بەناو پۆشتەن بەڵام ڕووتن لەنجەولار دەکەن و سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشن، قژیان وەک کۆپەرەی حوشتر لێدەکەن ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناکەن هەرچەندە بەهەشت لەدووری ئەوەندە و ئەوەندە ساڵ ڕێگەوە بۆنی دەکرێت.

باڵاپۆشی تەنها شتێکی ڕواڵەت نییە بەڵکو پەیوەندی بە ناخو قوڵایی ویژدان و دەروونەوە هەیە، باڵاپۆشی ڕەنگدانەوەی بیروبۆچونی ئافرەتە، نیشانەی پابەند بوونە بە فەرمان و گوێڕایەڵی پەروەردگارەوە، نیشانەی یەکڕەنگی ڕوحیەتی، ئافرەتی بڕوادار کاریگەری هەیە لەسەر یەکگرتنی بڕواداران و یەکریزی خوشکان و یەک مەبەستی کۆمەڵگەی ئیسلامی، هەر لەبەر ئەم کاریگەریە گرنگەبوو کە خاچ هەڵگرەکان پاش دانانیان بەشکستی خۆیاندا لەبەرامبەری موسوڵمانان، بڕیاریان دا شێوە پلانێکی دژوارتر دژی موسوڵمانان پەیڕەوبکەن ئەویش بەکار هێنانی ئافرەت بوو بەمەبەستی لێدانی ئاین و بەها مرۆییەکان و برەودان بە ئایدۆلۆژی مەبەستەکانی خۆیان، هەموو هۆکارێکیان دەستەبەر کرد لەپێناو پراکتیزەکردنی ئەم دەستەواژە ترسناکە کەدەڵێت: (پییاڵەیەک بادە و ئافرەتیکی لەش فرۆش لەدەیان تۆپ و هاوەن باشترە بۆ داماڵینی دین لەمرۆڤ ) تا ئێستاش ئەم دەستەواژەیە بەکارە و پەیڕە و دەکرێت کە، تیایدا ئافرەت بەجەستەی مادی و مەعنەوییەوە بۆتە قوربانی لەم پێناوەدا.

ئێستا بەهای بالاپۆشیمان زانی .... زانیمان چەندە پێویستیمان پێیەتی ... ئەی ئەو ڕێگرانە چین لەبەردەم بالاپۆشی ئافرەتانماندا؟



# ڕێگرییەکانی بەردەم باڵاپۆشی ئافرەتانمان کۆمەڵێک کۆسپ و گومان

ئەو خوشکانەی کە سفورن و حیجاب ناکەن، هۆکاری نەکردنی حیجاب دەگەڕێننەوە بۆ کۆمەڵیک بڕو بیان و کۆسپ و تەگەر، بۆیە ئێمەش لێرەدا وەڵامی ئەو بڕوبیانو کۆسپ و تەگەرانە دەدەینەوە، بۆ ئەوەی خوشکان هیچ ڕێگرییەکیان نەمێنی لە پۆشینی حیجاب.

**کۆسپی یەکەم /** خوشکی واهەیە دەڵێت: من باوەڕم بە حیجاب نییە.. لەوەڵامدا پێی دەڵێین تۆ کێیت و دینت چییە؟ لەوەڵامدا دەڵێت مسوڵمانم.... ئەی مانای موسڵمان بوون چی یە؟ موسوڵمان بوون مانای گوێڕایەل بوونی تەواوی پەروەدگارە، چونکە ناگونجێ من بەناو موسڵمانبم و گوێڕایەلی تەواوی خوای گەورە نەبم خوای گەورە دەفەرموێت:

{ وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ } [الأحزاب ٣٦]

واتە: (بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی ئیماندار دروست نییە کاتێک خواو پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ بڕیاری شتێک بدەن ئەوان سەرپشکبن لە ئەنجامدانی) باوەڕ نەکردن بە هەندێک لەئایەتەکانی (کفر)ـە چۆن دەبێت باوەڕت بە هەندێک لە ئایەتەکانی خوای گەورە هەبێت و کاری پێبکەیت و هەندێکیش لەو ئایەتانە پشت گوێ بخەیت خوای گەورە باڵاپۆشی (حیجاب) ی فەرز کردووە کەواتە هیچ ڕێگەیەکی ترت نیە دوای ئەو فەرمانانەی خوای گەورە .

**کۆسپی دووەم/** خوشکی وا هەیە دەڵێت بڕوای تەواوم بە (حیجاب) باڵاپۆشی هەیە بەڵام دایکم ڕێگرمە گەر بەقسەی نەکەم دەچمە دۆزەخەوە!! وەڵامی ئەم خوشکەمان بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەدەینەوە کەدەفەرموێت: (لاطاعة المخلوق في معصية الله عز وجل)[1].

واتە((گوێڕایەڵی نیە بۆ فەرمانی هیچ کەسێک کە سەرپێچی خوای گەورەی تێدا بێت )) هەرچەندە جێی دایک و باوک بەتایبەت دایک زۆر بەرزو پیرۆزە بەڵکو خوای گەورە لەگەڵ پەرستن و یەکتا پەرستی باسیکردوون لە چەند ئایەتێکدا وەک دەفەرموێت:

{ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْءًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا } [النساء ٣٦]

واتە: (خوا بپەرستن وە هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن وە لەگەڵ دایک و باوکتان چاک بن و ئازاریان مەدەن و دڵیان ڕابگرن) گوێ ڕایەڵی دایک و باوک پێویستە مەگەر لەشتێکدا پێچەوانەی خواو پێغەمبەرەکەی بێت ﴿ﷺ﴾

(١) ) أحمد و الحاكم وقال شيخ الألباني (صحيح)

وەک خوا گیان (ﷻ) دەفەرموێت:

{وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا} [لقمان ١٥]

واتە: (ئەگەر دایک و باوکتان (خوانەناس بوون ) هەوڵ و كۆششیان كرد شتێک بکەی بە هاوەڵم کەخۆت هیچی لێنازانی فەرمانیان بەجێ مەهێنە) وەگوێڕایەڵی نەکردنیان ڕێناگرێت لەچاکەکردن لەگەڵیاندا، ئینجا چۆن گوێڕایەڵی دایکت دەکەیت و فەرمانی خوای گەورە دەشکێنیت کە تۆش و دایکت دروستکراوی خوان بەڵام ئەمجۆرە کەسانەش لە ئافرەتان لە کەمی زانیاریانە یاخود لەبەر نەشارەزایی و بێ ئاگاییانە لە یاسای ئیسلام بۆیە ئەمجۆرە بیانوانە دێننەوە.

**کۆسپی سێیەم** / خوشکی وا هەیە دەڵێت: حەزم لە باڵاپۆشی هەیە بەڵام توانای مادیی وام نییە کەجل و بەرگەکانم بگۆڕم یان (حیجاب) ی پێبکرم لێرەدا دوو جۆر لە خوشکان هەن کە ئەو جۆرە پاساوانە دێننەوە:

یەکەمیان: ڕاستگۆ و دڵسۆزە بۆیە بەو جۆرە خوشکە دەڵێین: ئایا دەزانی ئافرەتی بڕوادار نابێ لەماڵەوە دەرچێ مەگەر بەمەرجی پێویستی بوون نەبێ؟ پۆشاکەکەشی دەبێ لەگەڵ ئەو مەرجانە بگونجێ کەشەرع بۆی داناوە، وە لەپێناو ڕەزامەندی خواو چوونە بەهەشت هەموو شتێکی قورس و گران بەها ئاسان دەبێت بۆت ئەگەر هەوڵی بۆ بدەیت، بەڵام جۆری..

دووەمیان: ڕاستگۆ نییە تەنها نیازی پاساو هێنانەوەیە و ئەیەوێ باڵاپۆشێکی گران بەهاو سەرنج ڕاکێشی دەست کەوێت کە زیاتر بەرچاو بێت بێ ئەوەی بیر بکاتەوە لەوەی کە باڵا پۆش (حیجاب) مەرج و نیشانەی خۆی هەیە کە دەبێت بەرگی شەرم و حەیابێت نەک خۆ دەرخستن.

**کۆسپی چوارەم/** خوشکی وا هەیە دەڵێت: دنیا گەرمە و منیش بە گەرما نارەحەت دەبم جا ئەگەر باڵاپۆشی بکەم ئەوەندەی تر گەرمام دەبێت.

بۆ وەلامی ئەم خوشکە و هاووێنەکانی دەڵێین گوێ بگرن و بزانن خوای گەورە چی دەفەرموێت: { قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ } [التوبة ٨١]

واتە: (ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر بفامن و هۆش بەکار بێنن ئاگری دۆزەخ گەرمترو بەتاو ترە، کەسێک بەرگەی گەرمای دونیا نەگرێ چۆن بەرگەی ئاگری ڕۆژی جەزا ئەگرێ) خوشکی ئازیزم چۆن بەراوردی گەرمی دونیا و دوارۆژ دەکەیت، وە بزانە ئەوە شەیتانە ڕاوی کردووی چونکە ئەو دەیەوێت لەگەرمای دونیا دەرت بکات بۆ گەرمای دۆزەخ جا ئازابە و خۆت ڕزگار بکە با گەرمی دونیا ببێتە یاد کەرەوەیەک بۆت بۆ گەرمی دۆزەخ، ئەو گەرمییەی کە چەندەها گەرمی دنیایە، جا هەوڵ بدە خۆت دوورخەیتەوە لێی ئەوەتا خوای گەورە دەربارەی ئەهلی دۆزەخ دەفەرموێت:

{ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا } [النبأ ٢٤ ٢٥]

واتـه: (لەنـاو دۆزەخدا ناچێژن فینکاییـەک یـا خواردنەوەیەکی بەتام جگـە لـە ئـاوی لەکوڵ و کێـم و زوخـاو نەبێت) کەواتـە پێویستە تـۆ هەندێـک مانـدوو بیت چونکـە ئاگاداربە بەهەشت بەناخۆشی و ناڕەحەتی دەوری گیراوە و دۆزەخیش بەئارەزووات ڕازاوەتـەوە، ئـەم دنیایـە بەندینخانـەی باوەڕدارانـە و بەهەشتی کافر و بێ باوەڕانـە جـا بۆیـە لێرە حیجاب کـردن لەسـەرت قورسـە بـەڵام لـەدوا ڕۆژدا پاداشـتت گـەورەیـە.

ووتەیەکی زۆرجوان هەیە کە دەڵێت: ((هەرکەسـێک سـەرەتاکەی بە قوربانیدان دەست پێ بکات، کۆتاییەکەی پرشنگدار دەبێت))، بـە دڵنیاییـەوە گـەر تـۆش لـەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیـا ئـارام بگریت لەسـەر ئـازار و ناڕەحەتییـەکان قیامەتت پرشنگدار دەبێت، زۆر چاک بزانـە خوشکی بەڕێزم کاڵای بەهەشت گرانە، هەرکـەس بیـەوێ ناوکی دەست بکەوێت دەبێ توێکڵی دەوری بشکێنێ.

**کۆسـپی پێنجـەم /** خوشـکی وا هەیـە دەڵێت: ئەگـەر ئێسـتا بـاڵا پۆشبم دەترسم بەیانی وازبێنم چونکـە خوشکانێکی وام بینیون کە باڵا پۆشبوون و وازیان لێهێناوە، لـە وەڵامی ئـەو خوشکە و هاوشێوەکانی دا دەڵێین: ئـەو جـۆرە بیرکردنەوانـە پێیـان دەڵێن وەپێشکەوتنی ڕووداو چونکە ئەگـەر هەموو کەسێک وابیر بکاتەوە ئـەوا لەوانەیـە ئێسـتا مسـوڵمانان وازیـان لـە نوێـژو ڕۆژوو و فەرمایشـتەکانی تـر بهێنایـە چونکـە کـە سـانێک نوێـژ دەکـەن و وازی لێدێنن، کەسـانێکیش هـەن کە وازیان لـە ڕۆژوو و زەکات هێنـاوە، جـا بزانـە خوشـکی بەڕێز ئـەوە شـەیتانە وات لێدەکات

وابیربكەیتەوە بەو بۆ چوونە لاواز و پوچانە، ئەمەش داویكە و تەڵەیەكە لە تەڵەكانی شەیتان بۆ ئەو كەسانەی دەڕازێنیتەوە تاكو ببن بە نێچیر، ئەگینا ئەو هەموو خەیاڵانە بۆچی؟ بەڵام ئاگاداربە و بزانە خوای گەورە كارێكی پێخۆشە بەردەوامبێت هەروەك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت:

(أَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلَى اللهِ تعالى أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ)[1].

واتە: (باشترین كارێك كەخوا پێی خۆشبێ ئەوەیە كە هەر كارێكت كرد بەردەوام بێت لەسەری با كەمیش بێت) ئینجا باشە بۆ چی لەو كەسانە ناكۆڵیتەوە كە وازیان لە باڵاپۆشی هێناوە تاببێت بەپەند و ئاموژگاری بۆتۆ تا هەوڵبدەیت بەسەر ئەو هەڵانەدا نەچیتەوە و هەڵەی ئەوان نەكەیتەوە، ئەوەتا تۆش ڕەخنە دەگریت لێیان، ئەی بۆ هەوڵنادەیت بەسەر ئەو هەموو هۆكارانە كە دەبنە هۆی دامەزراندنت لەسەر باڵاپۆشی و ئایینت وەجێبەجێی ناكەیت، وە هەندێك لەو هۆكارانەی كەدەبنە هۆی دامەزراویت لەسەر ئایین و باڵاپۆشی دوعا زۆر كردنە كەدڵت جێگیر بكات لەسەر ئایین وە نوێژەكانت لەكاتی خۆیدا بكە، بەزەلیلی داوای كۆمەك لەخوای گەورە بكە بۆ خوراگری و ئارام گرتن، گەر دەست بگری بەهۆكاری هیدایەت وەرگرتن و دامەزراوی و تامی باوەڕداریتیت چەشت ئەوا هەرگیز فەرمانی خوای گەورەت لەبیر ناچێت و وازی لێناهێنیت. كارێكی تر كە زۆر گرنگە ئەویش تێكەڵبوونە بەخۆشكانی موسوڵمان بەژداری كردنتە لەخۆشی و ناخۆشییەكانیاندا .

---

(١) ) بخاري (٦٤٦٤) ومسلم( ٧٨٢)

**کۆسپی شەشەم/** خوشکی وا هەیە دەڵێت: ئەگەر باڵاپۆش بم کەس نایاتە خوازبێنیم بۆیە بڕیارم داوە دوای هاوسەرگیری باڵاپۆش بم....!

لەوەڵامدا بەو خوشکە دەڵێین: ئەو پیاوەی تۆی بە جل و بەرگی ناشەرعی گەرەکە ستەمە تۆ ببێتە هاوسەری هەر شایەنی ئەوەش نییە بێتە خوازبێنیت. کەسێک فەرمانی خوا جێبەجێ نەکات شیاوی تۆی بەحەشم و حەیاو خاوەن باوەڕ نییە چونکە پیاوی نەفام و بێ باوەڕ هیچ جوامێرێکی تێدا نییە بەرامبەر بە حەرامکراوەکانی خودا، وە هیچ یارمەتیدەرت نابێ بۆ هەنگاونانت بەرەو ڕەزامەندی خواو ڕۆشتن بەرەو بەهەشت و دوور کەوتنەوە لە دۆزەخ، هەرماڵێکیش بنچینە و بناغەی لەسەر شکاندنی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ بێت ئەوا نەلەم دنیا خۆش دەگوزەرێت وە نە لەڕۆژی دوایی خوای گەورە دەفەرموێت: { وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَىٰ } [طه ١٢٤]

واتە: (ئەوەی ڕوی وەربگێڕێت لەبەرنامە و یادی من پشتی تێ بکات بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش هەیە و لەڕۆژی دواییدا بە کوێری حەشری دەکەین) دەبێ باشیش بزانین هاوسەرگیری بەهرەیەکی خواییە و شوکردن بەقەدەری خوایە باوەڕ بەقەدەریش لەبنچینەکانی ئیمانە، شووی باش و پیاوی باش یەکێکە لەنیعمەت و بەخششەکانی خوای میهرەبان، خوا بەهەرکەس بیەوێ پێی دەبەخشێ بەجل و بەرگ نییە چەندین ئافرەتی

باڵاپۆش گەیشتن بەهاوسەری خۆیان وەچەندین ئافرەتی سفوریش پرچی سپییان هۆنییەوە، خوای گەورە ئەگەر بڕیاری هاوسەرگیری بۆ دابێت بۆی نووسیوی کە، لەگەڵ کێدا، وە لە کەیدا، وە لە کوێدا هاوسەر گیری دەکەیت، بەڵام ئەگەر بۆشی نەنووسی بی، بە جل و بەرگی سفورییەوە بە نسیبت نابێت، وە خوای گەورە بەرەکەت ناخاتە هاوسەرگیرییەکەوە کەبەشکاندنی فەرمانەکانی بێت .

**کۆسپی حەوتەم/** خوشکی واهەیە زۆر بە نەزانانە پاساو دێنێتەوە یان بەچاکی تێنەگەیشتووە ئەویش ئەوەیە دەڵێت: خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموویت: { وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ } [الضحى ١١]

واتە: (باسی ئەو نیعمەتانە خوایش بکە کە پێتی داون) کەباشترین جۆری ئەونیعمەتانەی خودا بەکردەوە ئەوەیە بەشی هەژاران و دەست کورتانی لێ بدەیت، جا ئەو خوشکەش دەڵێت: جوانی ئافرەتیش نیعمەتێکی خواییە بۆیە دەرخستنی ئەو نیعمەتە پەیڕەو کردنی ئایەتێکی قورئانە، ئەم جوانیەم ناشارمەوە .

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم خوشکەمان گوێڕایەڵی خوایە بە بۆچوونی خۆی، بەو جۆرە قورئان ڕاڤە دەکات کە چۆن لەگەڵ ئارەزووەکانیدا بگونجێت دەیگونجێنێت هەر وەک خۆی پێی باشە، ئەی نازانی خوای گەورە دەفەرموویت:

{ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ } [النور ٣١]

واتە: (جوانی و لەشی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کەدیارە) (مەبەست دەست و دەموچاو )دەستیش تەنها مەچەک جا خوشکی خۆم بەو وتەیەت ڕێبازێکت بۆخۆت داناوە کە سفورییە ئەوەش پێچەوانەی فەرمانی خوایە هۆکارەکەشی نەناسینی خواو شەریعەتەکەیەتی، جا گەورەترین نیعمەت کە موسوڵمان شانازی پێوەبکات ئیمانەکەیەتی، کەواتە بۆ ئەوە دەرناخەیت و شانازی پێوەناکەیت (مەبەست لەباوەڕبوون پابەندبون بەدینی خواوە) بێگومان بالاپۆشی بەشێکە لەو نیعمەتە کە فەرمانێکە وەکو فەرمانەکانی تر، وەکو بەندایەتیەکانی تر، ئایا هیچ بەهرەیەک هەیە گەورەتر لە بالا پۆشی کەشانازی پێوەبکەیت کەنیشانەی باوەڕتە .

**کۆسپی هەشتەم** / خوشکی واهەیە دەڵێت: من ئەزانم بالاپۆشی فەرزە، بەڵام خوای گەورە هیدایەتی نەداوم، کاتێک دەیپۆشیم کە خوا هیدایەتم بدات !!

لەوەڵامی ئەوخوشکەماندا دەڵێین: ئایا ئەو هەنگاوانە چین بۆ ئەو هیدایەتەی چاوەڕوانی دەکەیت؟ چونکە ئێمە دەزانین کە خوای پەروەدگار بۆ هەر شتێک هۆکارێکی داناوە. بۆ نمونە نەخۆش سەردانی پزیشک دەکات بۆ ئەوەی دەرمانی بۆ بنوسێت و بیخوات تا خوای گەورە شیفای بدات، هەروەها قوتابی سەعی دەکات و هەوڵدەدات بۆئەوەی سەرکەوتووبێت لەدەرسەکانی، بەڵام ئایا ئەی تۆ چ ڕێگایەکت گرتوتە بەر بۆ ئەو هیدایەتەی کەچاوەڕێی دەکەیت؟ ئایا هیچ کاتێک تۆ دوعای بەکوڵت کردووە؟ یان بۆ جارێک لەجاران لەگەڵ

ئافرەتی خاوەن باوەڕدا دانیشتوویت و گوێت بۆ شل کردبێت، خوای گەورەدەفەرموویێت: { إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ } [الرعد ١١]

واتە: (خوای گەورە گۆڕان لەهیچ کۆمەڵگایەکدا ناکات تا خۆیان خۆیان نەگۆڕن ) دڵنیابە خوا ڕێنمونی تۆ ناکات بۆ باڵاپۆشی تاتۆ لە ناخەوە بڕیاری گۆڕانکاری نەدەیت، ڕاستە هیدایەت لەلایەن خوای گەورەوەیە، بەڵام تامردن دانیشیت و تەمەنا بکەیت نایەتە دی بێ هەوڵ و کۆشش کردن وەک حەسەنی بصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمویێت:

(ليس الأيمان بالتمنى ولا بالتحلى ولكنة شيء وَقَر في القلب وصدقه العمل)

واتە: (باوەڕ بەتەمەناکردن و خۆڕازاندنەوە نییە بەڵکو باوەڕ شتێکە لە دڵدا جێگیر دەبێت کردەوەش تەصدیقی دەکات ) جا لەبەر ئەوە مەڵێ خوای گەورە هیدایەتی نەداوم چونکە ڕێگای پیشانداوی بەخوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە یان بەگوێ گرتن لە ووتارێکی ئاینی خوای گەورە دەفەرمویێت: { وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ } [فصلت ١٧]

واتە: ((ڕێنمونی گەلی سەمودمان کرد بۆ چاکە بەڵام ئەوان ڕێگە خراپەکەیان پێ خۆش بوو هەڵیان بژارد )) ئایا واهەست ناکەی ئەم ئایەتە گفتوگۆ لەگەڵ تۆدا دەکات؟ خوای گەورە کەسی فەرامۆش نەکردووە ڕێگەی پیشانی هەموان داوە، کەواتە مەڵێ خوای گەورە هیدایەتی نەداوم .

**كۆسپی نۆیەم/** خوشكی واهەیە دەڵێت: جاری بچوكم و گەنجم هێشتا كات ماوە بۆیە كە، گەورە بووم یان حەجم كرد ئەو كاتە پۆشاكی شەرعی لەبەردەكەم .

لەوەڵامدا پێی دەڵێین: خوشكم بزانە فریشتەی ڕوح كێشان میوانە و لەبەر دەرگا وەستاوە و چاوەڕوانی خوایە فەرمان دەربكات بەگیان كێشانت چاوەڕێی جەنابت ناكات تا كارەكانت تەواو بكەیت خوای گەورە دەفەرموێت:

{فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ} [الأعراف ٣٤]

واتە: ((ئەگەر كاتی مردنیان هات نەتاوێك پێش دەكەوێ نەتاوێ دوادەكەوێ))، پێشینانیش دەڵێن ((شوان تا دانیشێت مەڕەكەی دووردەكەوێتەوە)) خوشكی بەڕێزم گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرە... پیاوێك دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: خێزانەكەم سوپاس بۆ خوا باڵاپۆشە كچێكی دراوسێمان هەبوو لەتەمەندا منداڵ بوو، ئەم كچە هەر چەندە جلەكانی لەحیجابی ئیسلامییەوە زۆر دووربوو بەڵام لەگەڵ خێزانمدا پەیوەندییان زۆر باش بوو كە، ئەمەش واجبی هەموو خوشكانی باڵاپۆشە تاخەڵكی سودییان لێ وەرگرن ...دەڵێت ڕۆژێك ئەم كچە داوای لەخێزانم كرد لەگەڵی بچێت بۆ بازار تا كابۆیەك بكرێت خێزانم بەزیرەكی و وریای خۆی ڕازی بوو بەو مەرجەی كەلەپێشدا بچن بۆ گوێگرتنی وتارێكی ئایینی ئەویش ڕازی بوو چوون بۆ گوێگرتنی ووتارەكە، بابەتی ووتارەكە لەسەر پەشیمانی و گەڕانەوەبوو بۆلای خوای گەورە كچەكە بە وتارەكە زۆر كاریگەر بوو لەكۆتاییدا، كە، ووتارەكە تەواو بوو

زۆر گریا تاکە ووشەی ئەوەبوو دەیووت (خوایە گەڕامەوە بۆ لای تۆ حیجابم لەبەر بکەن ) پێیان ووت ئارامبە دەچینەوە بۆ مالەوە و ئەو کات حیجاب لەبەرکە، بەڵام ڕازی نەبوو بەلکو سور بوو لەسەر ئەوەی کە حیجابی بۆ بێنن بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دانیشتبوو، حیجابیان بۆ هێناو لەبەری کرد، پاشان هەستا تا بڕوا، هەر لەگەڵ دەرچوونی لەو شوێنە سەیارەیەک لێیداو مرد، ماشاء اللە لەو عاقیبەت خێرییە، کەواتە هەرگیز مەڵی هێشتا تەمەنم کەمە هەر وەک ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەشعرێکدا دەفەرمووێت:

ئەی سەرقاڵ بەدونیاوە

تەفرە دراو بەهیواوە

مەرگ دڵۆپەی لەناکاوە

چیت بۆگۆڕ ئەنجام داوە

**کۆسپی دەیەم/** خوشکی وا هەیە پاساوی ئەوە دێنێتەوە دەڵێت من حەز دەکەم بالاپۆشی بکەم بەڵام دەترسم لەکاتی دامەزراندندا لەسەر کار دام نەمەزرێنن وەیان ئەگەر لەسەر کاربووم دوورم خەنەوە یان مامەڵەی باشم لەگەڵ نەکەن وە خۆم و ماڵ و منالم نان بڕاو دەبین.

لەوەلامدا دەڵێین:خوشکی ئازیزم وادەزانی ڕزق و ڕۆزی لەدەستی مرۆڤدایە، ئایا نازانی خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی دەری

تویە وەک دەفەرمووێت: { نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ } [الأنعام ١٥١]

واتە: (ئێمە رزقی ئێوە و ئەوانیش دەدەین ) کەواتە ئەگەر دەترسیت لەوەی نانبڕاوبیت یان دەڵێی لەبەر منداڵەکانت ئەوا ئەو رزقەی دیاری کراوە بۆت لەلایەن خواوە کەس ناتوانێت ڕێگری بکات لەوەی بەدەستت بگات یان بۆت زیادبکات لەبەر پۆشینی حیجاب...

وە خوای گەورە دەفەرمووێت:

{ وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ } [يونس ١٠٧]

(( ئەی ئینسا ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێکت بکات، ئەوە هیچ کەس ناتوانێت فریات کەوێت و لەسەرت لابەرێت جگە لەو زاتە، یاخود ئەگەر بیەوێت توشی خێر و خۆشییەکت بکات، ئەوا هیچ گەس ناتوانێت بەری فەزل و بەخششی خوا بگرێت، هەر کام کە بییەوێت لە بەندەکانی بەهرەوەر دەکات لە نازونیعمەتی بێ شومار، ئەو زاتە هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە)) هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:

{ قُل لَّن يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَانَا وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ} [التوبة ٥١]

واتە: (( ئەی پێغەمبەر(ﷺ) تۆش بڵێ هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگە لەوەی کە، خوا بۆی نووسیوین

(هەرچیش بۆمـان پێش دیت هـەر خێرە بۆمـان )، ئـەو زاتـە هەمیشـە یـار و پشـتیوانمانە دەبـا ئیمانـداران هـەر پشـت بـەو زاتە ببەستن)) وەژیانی دونیایەک وەک کاک ناسری سوبحانی دەڵێت کە ئەگـەر هیچ کەموو کوڕی تیانەبێ دووکەمووکوڕی چارەنەویستی تێدایـە:

یەکەمیان/ مرۆڤ ناگاتە حاڵەتێک کەبڵێت: ئۆخەیش هەرچیم ویست دەستم کـەوت .

دووەمیان/ ئەو بەشـەی کەدەستت کەوتووە دڵنیا نیت لـەوەی کەتا کۆتایی ژیان لەدەستت دادەمێنێتـەوە، جا کەوایـە لـە خوا بترسێ چونکە خوای گەورە دەفەرموێت { لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْئُولًا } [الفرقان ١٦]

واتـە: (لـەو بەهەشـتە دا هەرچی داوابکـەن بۆیـان دەسـتەبەر کراوە هاوڕێی لەگەڵ ژیانی نەبڕاوەدا ئەویش بەڵێنێکە لەلایەن پەروەردگارتـەوە خۆی بەرپرسیار کردووە ) .

**کۆسـپی یانزەیـەم/** خوشـکی واهەیـە دەڵێـت: ئەگـەر پۆشـاکی شـەرعی بپۆشـم دەترسم پەنجەی حیزبیم بۆ ڕابکیشن منیش ڕقم لەحیزبایەتییـە

لەوەلامدا دەڵێین: خوای گەورە دەفەرموێت:

{ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ } [الأحزاب ٣٧]

واتە: (لەخەڵک دەترسن کەچی خوا ڕەوا ترە لێی بترسن)

فەرمانەکانی خوا هیچ پەیوەندییەکی نییە بە حیزب و کۆمەڵ و لایەنێکی دیاری کراو، بالاپۆشی فەرمانی خواییە نەک حیزب، بیر بکەرەوە خوشکی بەڕێزم ئەو پێغەمبەرەی ﴿ﷺ﴾ کە رەحمەتێک بوو بۆ گشت جیهان، پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، نازناوی (صادِقُ الأمین) واتە:( ڕاستگۆ و دەست پاک) یان لێ نابوو هەتا بێباوەڕەکان و بت پەرستەکان ئەمانەتیان لەلا دادەنا، بەڵام کاتێ بووە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد پێیان دەوت محمەد ﴿ﷺ﴾ شێت بووە و سیحری لێکراوە نزیک ترین کەسیان کە (أبولهب) ی مامی بوو لەهەموویان خراپتر بوو، بەڵام پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چونکە بانگەوازەکەی حەق بوو گوێی بەو تانەو تەشەرانە نەدا، هەتا دەیفەرموو:(یان لەپێناو ئەم دینە تیادەچم یان خوای گەورە سەرم دەخات) دیارە کەخوای گەورەش سەری خست، ئەوەتا ئەمڕۆ ئەم دینە گەیشتووە بەئێمە وەزیاتریش ئەڕوا و هەر لە بڵاوبوونەوەدایە، ئینجا بۆیە خوشکی موسلمانم تۆش ژیان و هەڵوێست و جوامێری و مەردایەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بکە بەشورایەک بۆ وەڵامی ئەو کەسانەی تانە و تەشەرت لێدەدەن .

**کۆسپی دوانزەیەم/** خوشکی وا هەیە دەڵێت: بالاپۆشی وا دەبینم فلان شت و فلان شتی خراپ و نەشیاو و بەدڕەوشتی دەکەن بۆیە بالاپۆشی ناکەم.

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەو ئافرەتانەی تۆ بینیوتە کاری خراپەکارییان کردووە یان سواڵکەری دەکەن ئەوانە بەپارەیەکی کەم و

شت و مەكی بێنرخ بەكرێگیراون بۆ ناشرین كردنی باڵاپۆشی، ئەو كەسانەی ئەو كارانە دەكەن هەر بۆ خۆیان سوك و ڕسوا دەبن كوردوتەنی (دەریا بەدەمی سەگ پیس نابێت)، یان خۆ زۆر كەس نوێژدەكەن و كاری خراپیش دەكەن، ئایا بەخراپەی ئەوان نوێژكردن خراپ دەبێت، یان زۆر كەس دەچن بۆ حەج و لە ژێر پەردەی حەجدا كاری خراپ دەكەن، كەواتە ئێمە حەج نەكەین؟ بەو كارەی ئەوان حەج كردن خراپ دەبێت، یان ئەوان خراپ دەبن، ئایا حیجاب پۆشین خراپە یان ئەوكەسەی حیجاب لەبەر دەكات و كاری خراپیش دەكات؟ جا لەبەرئەوە خوشكی ئازیزم خۆت مەكە بەقوربانی لەبەر خراپەی خەڵكی چونكە خوای گەورە دەفەرموێت:

{ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ } [فاطر ١٨]

واتە: (كەس خراپەی كەس هەڵناگرێت) .

**كۆسپی سیانزەیەم/** خوشكی واهەیەدەڵێت (حیجاب گرنگ نیە) گرنگ ئەوەیە مرۆڤ (دڵی) پاك بێت منیش دڵم پاكە و دڵیش مەرجە، من نوێژ ئەكەم و شەو نوێژو نوێژە سونەتەكانیش بەجێدەهێنم و لەڕێی خواشدا دەبەخشم .

لەوەلامدا دەڵێین:

دەی تۆش لەڕۆژی دواییدا بەخوای گەورە بڵێ من زۆربەی پەرستشەكانم جێبەجێكردووە و ئەمەش بەسە بەڵام حیجابم نەكرد لەبەر ئەوەی دڵم پاك بوو خوای گەورەش دەفەرموێت:

{ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ } [البقرة ٨٥]

واتە: (ئایا بڕوا بەهەندێک لەقورئان دێنن و بڕوا بەهەندێکی تر ناهێنن)، با پێکەوە لەشتێک بکۆڵینەوە، تۆ زۆربەی پەرستشەکان بەجێ دەهێنیت بەدڵێکی پاکەوە و پاداشتێکی زۆربەدەس دەهێنی، پاشان بەدانەپۆشراوی دەچیتە دەرەوە، هەر پیاوێک بۆت بڕوانێت تاوانت بۆ دەنووسرێت لەبەرئەوەی فەرمانی خوات بەجێ نەهێناوە، لەوەیە بڵێیت ئەوە کێشەی پیاوە ئەو تەماشا دەکات، ئەویش تا تەماشا بکات تاوانی بۆ دەنووسرێت، بەڵام بۆ تۆ بەدوو هێندەی ئەو بۆت دەنوسرێت، چونکە تۆ بوویتە هۆکار، بزانە کاتێک دەچیت بۆ قوتابخانە یان بەسەر شەقامەکاندا دەڕۆیت یان لەناو پاسدایت یان دەچیت بۆ سەیران هەروا بژمێرە ڕۆژی چەند تاوان کۆدەکەیتەوە لەهەزار زیاتر ئایا ئێستا چاکەکانت بەش دەکات؟ یان زیاد دەبێت؟ من وادەزانم وەک ئەوە وایە کیسەیەکت پێبێت لەژێرەوە دڕابێت هەرکاتێک لەسەرەوە چاکەی تێدەکەیت لەژێرەوە دەکەوێتە خوارەوە بەواز هێنانت لەباڵا پۆشی.

**کۆسپی چواردەیەم/** خوشکی واهەیە دەڵێت: من نامەوێ حیجاب لەبەر کەم چونکە لەگەڵ مۆدێل ناگونجێت.

لەوەڵامدا دەڵێین: توگەورەیی ئەو خودایە مۆدێلت بەلاوە گرنگترە لەفەرمانی خوا؟ ئایا لەتەرازووی تۆدا مۆدێل سەنگینترە یان فەرمانی خوا؟ تا ئەو ڕادەیەی بەکەم سەیری فەرمانەکانی خوا دەکەیت و بەگەورەیی تەماشای مۆدێل دەکەیت، کام مۆدێل؟ ئەو مۆدێلەی کە لە ڕۆژئاواوە بۆمان

ئاودیو كراوە، لەو وولاتانەی كە بە حیساب دەڵێن پڕە لە ئازادی و بەختەوەری و حەسانەوە، دەبێت ئەو ئازادییە چۆن بێت؟ بەڵكو تەماشایەكی ئەو وولاتانە بكە كە دەڵێن ئازادی تێدایە ....

* لە وولاتی ئەمریكا ڕۆژانە هەزار و نۆ سەد كچ دەست درێژیان دەكرێتە سەر لە (٢٠٪)ی ئەوان لەلایەن باوكی خۆیانەوەیە .

* وە هەروەها لە ئەمریكا ساڵانە یەك ملیۆن منداڵ دەكوژرێت چ بە ڕێگەی لە باربردن بێت یان لە كاتی لە دایك بووندا بێت .

* وە لە بەریتانیا سەد و حەفتا كچ سكی پڕ دەبێت لە هەموو هەفتەیەكدا .

چەندەها ئافرەت هەیە لە وولاتی ئەوان خۆزگە بە داپۆشینەكەی تۆ دەخوازن، تەنها تۆزێك بیر بكەرەوە كچێك پارچەیەك پەڕۆ دەبەستێت لەسەری گەورەترین دەوڵەت لەئەروپا پێی دێتە لەرزین؟! ئایا ئەو ڕوداوە تۆش ناهەژێنێ؟ تەنها یەك تۆز تێرامێنە.

كچێك .... كچێكی بچوك بە حیجابەكەیەوە بەو پەڕی باوەڕ و متمانە بە خۆبووونە بەسەر شەقامەكانی لەندەندا ڕێدەكات، ئایا ئەم ڕوداوە پاڵت پێوە نانێت بۆ ڕاستكردنەوەی بە هەڵە تێگەیشتن لە حیجاب جارێكی تر بە دیدێكی نوێوە سەرنجی ژیانت بدەیتەوە، فەرمانەكانی خودا ڕوناكی بەدڵ و ڕوخسارت

دەبەخشێت بەڵام ئەو مۆدێلەی کە بەهۆیەوە فەرمانی خوات بەلاوە ناوە دەبێتە هۆی بێنرخی لەدنیاو خەسارەت مەندیت لەقیامەت دا .

**کۆسپی پانزەیەم/** خوشکی وا هەیە دەڵێت: من ئەگەر بالا پۆشبم شەرم دەکەم بچمە ناو هاوڕێکانم .

لەوەڵامدا دەڵێین:خوشکی ئازیزم شەرم دەکەیت لەهاوڕێکانت بە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا بەڵام شەرم لەخوا ناکەیت کاتێک بێ فەرمانی دەکەیت... ئەی باشە بۆ هاوڕێکانت شەرم لەخودا ناکەن؟ بۆ شەرم لەخواناکەن لەکاتێکدا بێفەرمانی خودا دەکەن ....بۆیە لۆمەی خەڵکی بەلاوەنێ کاتێک تۆ لە عیبادەتدای بۆ ئەوەی لەقیامەتدا خوای گەورە لۆمەت نەکات و سزات نەدا.

**کۆسپی شانزەیەم/** خوشکی واهەیە دەڵێت: نامەوێ بالاپۆشبم چونکە پێم دەڵێن دواکەوتوی و کۆنەپەرستی.

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەی خوشکی ئازیزم بەجێهێنانی فەرمانی خودا ئەگەر نەبووبێتە هۆکاری سەرکەوتن و پێشکەوتن ئەوا قەت نەبووە و ناشبێتە هۆی دواکەوتن....پاش ئەوەش ئەگەر ڕوتی ئافرەت مانای پێشکەوتن بێت ئەوا تەشبیە نەبێت بە تۆ ئاژەڵ لەهەموو کەس پێشکەوتووترە، چونکە ئاژەڵ ڕووتە بۆیە هەرگیز بەو بیانوانە خۆت هەڵمەخەڵەتێنە .



# زیانەکانی سفوری ئافرەت و خۆڕازاندنەوەیان لەناو نامەحرەم دا

**یەکەم:** لاواز بوونی شیرازەی خێزانداری و زیادبوونی گرفتی کۆمەڵایەتی.

**دووەم:** ئاسەواری خراپی لەسەر گەنج و لاوان .

**سێیەم:** دیاردەی چینایەتی .

**چوارەم:** مەیلی پیاوی ژنخواز.

**پێنجەم:** گۆڕینی دیمەن و شێوەی واقعی و خۆگۆڕین لەبەرامبەردا.

**شەشەم:** زیانی لایەنی ئابووری.

زیانی لایەنی ئابووریش كە هیچی كەمترنیە لەزیانەكانی تر جا ئەگەر هاوكێشەیەكی سادە بخەینە پێش چاو بەمەبەستی رادەی زیانی ئابووری زیادە خۆنواندنی ئافرەتان كە لەگەل چ ژمارەیەكی ترسناكدا ڕوبەڕو دەبینەوە، ئەگەر وادابنێین لەكوردستان تەنها (٥٠) هەزار ئافرەت بەزیادەڕەوی خۆی دەرازێنیتەوەو داوو دەرمانی زیاد لەحەد بەكاردێنن، وە هەر یەكە (١٠)دۆلار لەخۆڕازاندنەوە و داوو دەرمانی سەرو سیماو دەست و پێدا خەرج دەكەن، دەزانن لەڕۆژدا و لەمانگدا و لەساڵدا دەگاتە چەند دۆلار؟

فەرموو سەیرێكی ئەم هاوكێشە زۆرسادە بەلام ترسناكە بكە، پاشان ویژدانی خۆت بكە دادوەر و بڕیاربدە چ دەمێنیتەوە بۆ ئەو هەموو زیادە خەرجی و ماڵ فەوتاندنە؟

بەلایەنی كەمی خەرجی زیادەڕەوی خۆڕازاندنەوەی (٥٠) هەزار ئافرەت لەیەك مانگدا ئەگەر تەنها (١٠) دۆلاریش بێت بۆ هەرئافرەتێك، دەكاتە (٥٠٠) هەزار دۆلار بۆ (٥٠)هەزار كەسەكە لەمانگێكدا، وە لەساڵدا دەكاتە(٦)ملیۆن دۆلار، ئەی ئەگەر حەقی پرچ و قژ لول كردن و سەر گڤكردن و كرێی سالۆنەكان بخەینە سەری دەبێت چ ژمارەیەك بێتە دەستمان؟

ئەگەر بۆ ئەو(٥٠)هەزار ئافرەتە تەنها لەمانگێكدا (٥) دۆلار دابنێین بەزیادە خەرج بۆ ئەو بوارانە، بۆمان دەردەكەوێت كە لەڕاپەڕینەوە تابەرواری نووسینی ئەم نامیلكەیە واتا بۆ (٢٩) ساڵ، ئەوا(٢٦١) ملیۆن دۆلار خەرج كراوە..

چەندین کاری تری پڕسودمەند هەبوو کە دەبوا لەو بڕە کەمتریان بۆ تەرخان بکرێت .....

لەکاتێدا دەبێت ئەوە بزانیت یەکێک لەو پێنج پرسیارەی کە لە ڕۆژی دوایی دا لێت دەکەن ئەوەیە کەلێت دەپرسن ئەو سامانەی هەت بوو لەچیدا سەرفت کرد؟ لەوەلامدا دەڵێیت چی؟ .



# ئایا ئاسودەیی لە گۆرانی و ناوبانگ و سەمادایە یان ئیمان و ڕەوشتی بەرز و باڵابۆشی؟

بەداخەوە زۆر خوشک دڵیان گیرۆدە بووە بەدیمەنی جوان و جلی ڕەنگا و ڕەنگ و خۆجوان کردن و، خۆڕازاندنەوە بە ماکیاج و دەرمان، ئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لە خوشکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ئەو هونەرمەندانە لە بەهەشتدا دەژین؛ پێیان وایە لە لوتکەی خۆشگوزەرانیدان.

ئەوەمان بیرچوو کە ئەوە تەنها نمایش کردنێکە و کاتییە و، تایەک چرکە دوای لابردنی کامێراکە بڕناکات، بیرمانچو کە ئەو لاشانە دەکڕدرێن و بە چەند دۆلارێکی کەم دەهێنرێنە سەر شاشە و ئەوەش ناچار بەم کارەی کردووە یان دەست کورتی و پێویستیانە بەو پارەیە یاخود خراپی بیر و باوەڕیانە.

وەرە خوشکەکەم گوێ بگرە یەک لە نووسەرەکان لە ژمارەی (٣٣٠٠) ی ڕۆژنامەی (الأیام) دا لە ژێر ناونیشانی (کە نیزەکانی نێو ڤیدیۆ کلیپ) دا دەڵێت: لێکۆڵینەوەیەکی وێنەیم خوێندەوە لە سەر بازاڕی کەنیزەکان، بە مانای کە لیمە

لێکۆڵینەوەیەکی ئابڕووبەرانە بوو !! ئەو بازارە بریتی بوو لە بازاڕی کەنیزەکان، کە هەندێک لە ژێر ناونیشانی هونەر و ڕاگەیاندندا بانگەشەی بۆدەکەن. تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەڵێت: ئەو ئافرەتانە نرخەکانیان جیاوازە، بەپێی لیست پۆلێنکران، کەتەلۆکی ئامادەکراو هەیە لەو بازاڕانەدا بۆ خستنە ڕووی ئەو ئافرەتانە ...

گەنم ڕەنگ نرخێکی هەیە!! ڕەنگ سوور نرخێکی هەیە!! بالا بەرز نرخێک! تەمەن نرخێک!

ڕادەی جوانی نرخی! وولاتەکانیش هەریەکە نرخی خۆیان هەیە! جوان سەماکردنیش نرخێکی هەیە! هەندێک ئافرەتیش هەن نرخەکانیان هەرزانە .

**ئەی کچەکەی ئیسلام....**

وریابە، کە ئەو ئەمن و ئیمانەی تۆ تێیدا دەژیت، ئەو نزیک و تێکەڵییەت لە دایک و باوک وکەس و کارو نزیکانت، ئەونیعمەتی ماڵی خۆت و ئەو منداڵی کە لە ئێستا یان لە داهاتوودا انشاء الله پێی دەگەیت، ئەو داوێن پاکی و پۆشتەییە، ئەو دین و ئەخلاقە، ئەو ئارامی وسەقامگیرییەی خێزانەکەت ئاواتی زۆر کەسە، ئەو ئافرەتانەی کە تۆ خەو دەبینی پێیانەوە وەک ئەوانت لێبێت، زۆر دڵنیابە و چاک بزانە کە، ئەوانیش خەو دەبینن و ئاواتە خوازن وەک تۆیان لێبێت، لێت دەپرسم کامتان لە سەر حەقن؟

زۆرن ئەوانەی وادەزانن سەعادەتی مرۆڤ لەوەدایە دەوڵەمەندبێت، ناوبانگی هەبێت، جوان و هەڵکەوتوو بێت، وەکو دەگوترێ سێ کوچکەی سەعادەت، ئەوەش وای لە زۆر کچ کرد بکەوێتە دوای ئەو سەعادەتە وەهمییە و لە پیناو بەدەستهێنانیدا هەوڵەکانی بەگەڕ بخات ئەوانە لەوەیە ئەوە فریوی دابن کە، ژمارەیەکی زۆری ئافرەتە گورانی بێژە بە ناوبانگەکان و دەوڵەمەندەکان ئەو سێ کوچکەی سەعادەتەیان بە دەست هێناوە .

**بەڵام ئایا سەعادەتی ڕاستەقینەیان بە دەست هێناوە؟**

ئەی خوشکی ئازیزی من ..... داوات لێدەکەم لە زمانی خۆیانەوە وەڵامی ئەو حەزەت وەربگرە،بە زمانی خۆیان وتویانە و بە دەستی خۆیان نووسیویانە ..... یەکێ لەوانەی نامەی نووسیوە بۆ بانگخوازیێک دەزانیت کێیە؟ ( مارلین مۆنرۆ ) ئەو ئافرەتەی گەیشتە لوتکەی ناوبانگی جیهان، دە وەرە گوێی بۆ بگرە، گوێ لە ڕازە غەمبارەییەکەی دڵی بگرە کە لە کۆتایی گەشتی شوهرەت و ناوبانگ پەیدا کردنەکەیدا دەڵێت: خۆت بپارێزە لە ناو و ناوبانگ، خۆت بپارێزە لە هەر کەسێک دەیەوێت فریوت بدات، من کلۆلترین و داماوترین ئافرەتی سەر ئەم زەوییەم، نەمتوانی ببمە دایک، من ئافرەتێکم لە هەموو کەس زیاتر ژیانی خێزانی و ماڵم بە لاوە پەسند ترە لە هەموو شتێکی تر، سەعادەتی ڕاستەقینەی ئافرەت لە سەربەرزانە و پاکی ماڵ و خێزاندارییە، نەک هەر ئەوە بەڵکو ئەوە ڕەمزی سەعادەتی ئافرەتە.

خوشکەکەم ئەمانەش کۆمەڵێک گۆرانی بێژ و بەناو هونەرمەندن، کە بەداخەوە لەوەیە زۆر بەتاسەوە بیت ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەیتە ئەو پلە و مەقامەی ئەوان، بەڵام بزانە کۆتایی ئەوان بەچی گەیشت، یاخود ژیانیان چۆن کۆتایی پێهات؟ فەرموو:

١_ خانمە گۆرانی بێژی کۆری بە ناوی ( کولی هی ڕیون ) تەمەن ٢٦ ساڵ بەهۆی کەئابەی دەروونییەوە لە ساڵی ١٩٩٧ خۆی کوشت، هەروەها هاو نیشتمانییەکەشی خاتوو ( جیونج دابیت ) ی تەمەن ٢٧ ساڵ لە کانوونی دووەمی هەمان ساڵدا لە خانووەکەی خۆیدا خۆی کوشت.

٢_ هونەرمەند ( لی هی ڕیوت ) لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا تووشی کەئابە و ئاڵۆزی دەروونی بوو بەهۆی ئەو گرتە سێکسییانەی کە لە فیلمی ( پەیامی وەنەوشەییدا ) گرتبووی خۆی کوشت.

٣_ هونەرمەندێکی بەحرەینی بە ناوی ( شەیما سەبت ) خۆی کوشت، دەوترێ کە پەیوەندی بەماددە سڕکەرەکانەوە هەبووە.

٤_ گۆرانی بێژی تونسی ( ژیکرا ) کە مێردەکەی پیاوێکی دەوڵەمەندبوو بە ناوی (أیمن السویدی ) لە ئەنجامی غیرەکردن لێی بە دەمانچەیەک کوشتی پاشانیش خۆی کوشت.

٥_ هونەرمەندێکی کوێتی بە ناوی (شەیما) لە شوقەکەی خۆیدا لە باکووری (کوێت) بەکوژراوی دۆزرایەوە.

٦_ هونەرمەند (ویراد حەمدی) لەلایەن خزمەتکاری چێشخانەکەیەوە کوژرا، چونکە وای زانی بوو ئەو جوانکاری و خشلانەی بەخۆیدا کرد بوون ئالتونن تا بیان دزێ لەکاتێکدا هیچیان ئالتون نەبوون.

٧_ هونەرمەندی ئیماراتی (هوزان تمیم) لەلاین میردەکەیەوە کوژرا و پاشانیش خۆی کوشت.

٨_ هونەرمەند ( دالیدا ) خۆی کوشت، سەرەرای ئەو هەموو ناو بانگ و دەولەمەندییەی هەیبوو، لەگەرەکێکی قاهیرە سەری هەلدا، لەسالی ( ١٩٥٦ ) دا چوو بۆ فەرەنسا و ناو بانگێکی دەرکرد کە هیچ گورانی بێژێکی عەرەبی پێش خۆی نەیگەیشتبوویە، لە ماوەی ( ٢٠) سالدا (٦٠٠) گورانی بە ( ٨) زمان ووت کە نزیکەی ( ٨٥ ) ملیۆنی لی فرۆشرا، چەندەها خەلاتی جیهانی لەسەر وەرگرت، ئەمانە هیچی بەختەوەریان نەکرد و سەر ئەنجام لەسالی ( ١٩٨٧ ) خۆی دەرمانخوارد کرد، نامەیەکی لە لای خۆیەوە بەجی هشت تێیدا نوسرابوو( الحیاە لاتحتمل سامحونی) واتە: ژیان ناگوزەری و تەحامولی ناکری) بمبورن.

٩_ گورانی بێژ و راقیسەی یونانی ( مادونا ) پاش ئەوەی بۆ ماوەی ١٠ سال وازی لەگورانی ووتن هێنا و بە هەژاریی مایەوە، هەولی خۆکوشتنیدا، بەلام خۆی نەکوشت، پاش هەولەکەی هۆکاری خۆکوشتنەکەی گەراندنەوە بۆ ئەوەی کە هونەرمەندانی وەک (نانسی و ئەلیسا و هەیفاوەبی ) ناوبانگیان لەم سەندوتەوە بۆیە کارەکانی رەواجیان نەماوە،

هەروەها بەهۆی هەژارییەوە هانای بۆ ڕۆژنامەكان بردووە تا حوكمەت و خەڵكی یارمەتی بدەن لەو بارودۆخە داراییە ڕزگاری بكەن، چونكە ماوەیەكە دەرهێنەر و ئاهەنگگێران نە ڕۆڵی پێدەدەن، نە وەك سەماكەرێك هەڵیدەبژێرن، بەهانەشیان ئەوەبوو كە ئەم گۆرانی تازەی نییە كاتێكیش گۆرانی تازەی بۆ بردوون بەڵام ڕایان نەگۆڕیوە، تەنانەت داوای لە كۆمپانیای ( ڕۆتانا ) كردووە ئەلبوومێكی بۆ دەركەن بەڵام ئەو پارەیەی پێیان داوە تەنها بەشی ڕیكلامەكەی كردووە.

_ئەمانەش كۆمەڵێك هونەرمەندن دوای ئەوەی تاڵی تاوان و دوور لە خوایی وبێزاری ژیان چوو بە گەرویاندا و بۆیان دەركەوت و دیتیان بەچاوی خۆیان كە ئاسودەیی ژیان مانای ئەوە نییە لە دونیای هونەر دابی .... مانای ئەوە نییە لە دونیای گۆرانی و سەما دابی، بۆیان دەركەوت كە دروست كردنی هەواری شادمانی ژیان لە ناو و ناوبانگ و شوهرەت و سفوری و بێ بەرگی و دوور لە شەریعەتی ئیسلام دروست ناكرێت، بۆیان دەركەوت كە چەندین ساڵە لەسەر ڕێگەی هەڵە بوون، بۆیە بۆ دوا جار ڕەورەوەی ژیانیان بە لای خودا بادایەوە و لە سوچێكی ئەم ژینەدا لە پاڵی ئەم ئایینە پاكە خۆیان گرتەوە، ئەوانیش:

هونەرمەندانی مصری (مەدیمە كامل)، (شمس هلبارودی)، ( ناهیدا یوسرا )،( نجوی فوئاد).

هونەرمەندی سەماکەری سوری ( شاهید شەریف )

هونەرمەندانی تری وەک (نیلی ئەمین )، (میرڤە ئەمین )

هونەرمەندی تورکی ( حەنا تورک )، تەنانەت ( حەنا تورک) کافتریایەکی داناوە جگە لە ئافرەتی بالاپۆش ناهێڵێت هیچ کەسێکی تر بچێتە ژوورەوە.

ئێستا دەڵێیت چی خوشکی من؟ ئێستاش حەز دەکەیت و بەهیوای وەک ئەو هونەرمەندانەت لێبێت کە بە چ شێوازێکی ناشرین و قێزەون کۆتایی بە ژیانیان هات؟ یان تۆش پەشیمان بوویتەوە لەو حەز و هیوایەی کە هەتبوو.

نەک هەر تەنها ئەو هونەرمەند و گۆرانی بێژانەی سەرەوە کە، باسمان کردن، کە وازیان لە هونەر و گۆرانی ووتن هێناوە و خودا هیدایەتی داون و ڕێگای دین و بالاپۆشیان گرتووەتە بەر، بەڵکو چەندین ئافرەتی تری بەناوبانگ لە بوارەکانی تردا، گەڕاونەتەوە سەر ڕێگای ڕاست و درست و پاکی ئیسلام، لەوانەش:

١_ لە هندستان ( د.کامەلا داس ) پاڵێوراو بۆ خەڵاتی نۆبل موسڵمان دەبێت، کە، بەڕاستی ئازایەتییەکی زۆری دەوێت کە، هندۆسییەکی دەوڵەمەند و ناسراو موسڵمان بێت و بتوانێت خۆی لە بەرامبەر توڕەیی توندڕەوە هندۆسییەکان بگرێت، دکتۆر کامەلا داس شاعیرێکی ناسراوە لەسەر ئاستی جیهاندا و هەروەها چیرۆکنووسیشە کتێبێکی هەیە بە ناوی ( چیرۆکەکەم ) کە بۆ زیاتر لە پانزە زمانی بیانی وەرگێردراوە، هەروەها

چەندین خەڵاتی بەهۆی نووسینەوە بە دەست هیناوە، وەك:( خەڵاتی شیعری ئاسیایی و خەڵاتی نووسینی ئینگلیزی وولاتانی ئاسیا، هەروەها خەڵاتی جیهانی ئاسیا )، ڕاگەیاندی ئیسلامبونی خۆی لە ۱۱ /۱۲/۱۹۹۹ لە کۆنگرەی گشتی (کاچینی) شارەکەی خۆی ڕاگەیاند، کە، لە کۆنگرەکەدا ووتی: ( من بە هیچ جۆری دژی هیچ ئایینێک نیم ، من تەنها ئەو ئایینەم هەڵبژاردووە کە، ئافرەت دەپارێزێت )، کاتێک پرسیاریان لێ کرد کە چ شتێک سەرنجی ڕاکیشاوی؟

لە وەڵامدا ووتی: ئەو باڵاپۆشییەی کە ئافرەتی موسڵمان دەیپۆشێت زۆر بە دڵم بوو، هەروەها شێوەژیانی رێکوپێکی کە ئافرەتی موسڵمان تێیدا دەژیت، هەروەها ووتی ئازادی لای من بریتییە لەو باڵاپۆشییەی کە دەیپۆشم، هەرگیز لە پێش ئیسلام بوونم ئەو هەستە پڕ لە خۆشییەم لە ژیانی خۆم هەست پێنەکردووە، بە ئیسلام بوونم هەست دەکەم بوومەتە کەسێکی خۆشەویست و هەروەها پارێزراو .

٢ _ ( خەدیجە سو واتسۆن ) قەشەی پێشوو و مژدەدەری مەسیحی و هەڵگری بڕوانامەی ماستەر لە لاهوت و مامۆستای زانکۆ موسڵمان دەبێت و، وە جگە لەوەش ئێستا خوشکە خەدیجە مامۆستای کچانە لە یەکێ لە مەڵبەندەکانی بانگەوازی لە جدە .

٣ _ ( منی بانکیر ) پەرستاری تەمەن ٢٥ ساڵی هیندی، دوای لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام و بەراورد کردنیان بە ئایینەکانی تر، موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و، هەربەوەش نەوەستا بەڵکو

دەستی کرد بە بانگەواز کردن و ووتاردان کە لە ئەنجامدا حەوت کەس لەسەر دەستیدا موسڵمان بوون.

٤ _ ( ڕوبا ) ئەو بانگخوازە مەسیحییە دەمارگیرییە بوو کە لە پێناوی بانگەواز کردن بۆ ئایینی مەسیحی چەندین قوربانی دا لەژیانیدا و زۆر شوێن گەڕا، بەڵام لە کۆتاییدا ووتی: لە دوای ئەو هەموو خزمەتەم بە مەسیحییەت و هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت کە من بۆ ماوەی ٢٤ ساڵە ڕێگاکەم هەڵە بووە، بۆیە بە بەرچاوی هاوڕێ موسڵمانەکانی زۆر بە قەناعەتەوە ووتی (أشهد أن لا اله الا الله و أشهد أن محمد رسول الله) موسڵمانبونی خۆی ڕاگەیاند.

٥ _ ( مالین ) ی مەسیحی ڕۆژنامەنووسی سویدی موسڵمانبونی خۆی ڕاگەیاند و ناوی خۆی کرد بە ( عائیشە ) و بۆ ڕۆژنامەی ( ئێکس پرنسی ) دەدوێ دەڵێت: لە بەراورد کردنی ئایینەکاندا تەنها لە ئیسلامدا گشت ڕاستییەکانم بۆ دەرکەوت، ئەو کاتەی قورئان دەخوێنم ڕاستییەکانم بۆ دەردەکەوێت، بڕواداریم وام لێدەکات میهرەبان و لەسەر خۆبم، من ئاسودە و بەختیارم کە سەرپۆشم پۆشیوە، لە ئیسلامدا ڕێگای بنیاتنانی ژیانم دۆزییەوە، قورئات سۆماو گلێنەی چاوانمە بەبێ قورئان واتە لە دەرەوەی ژیان دەژیم، لێرە بە دواوە هەوڵدەدەم بۆ زیاتر شارەزابوون لە ئیسلام بۆ ئەوەی بتوانم وەڵامێکی ڕاست و دروستی ئەو کەسانە بدەمەوە کە پرسیار دەکەن و ڕخنە لە ئسلام دەگرن، چونکە ئیتر وەک موسڵمانێک ڕەفتار دەکەم و دەژیم دەبێت بە موسڵمانیش بمرم.

# ئەزموونی هەندێك لەو خوشكانەی بوونەتە باڵاپۆش

چەند خوشكێك دوای ئەوەی بوونەتە باڵاپۆش بە بێ دوودڵی ئەم تاجە زێڕین و گەوهەرەیان نایە سەر و خوای خۆیان هەڵبژارد بەسەر نەفس و شەیتان و مۆدێلی نەشیاو، وە زانیان كە ڕەزامەندی خوای گەورە لەم پارچە قوماشەدایە كە جەستەیان پێداپۆشن، سیفەتی حیشمەت و حەیایان كردە كاڵای باڵایان، وە سیمای ئازادی و نوێخوازیشیان پێشكەش بە گەل و میللەتەكەیان كرد، بە پشتیوانی خوای گەورە ئەزموونی هەندێك لە باڵاپۆشتان بۆ دەخەینە بەر دیدەی ئێوەی بەڕێز هەتا تێبگەن سەفەر كردن بۆلای خوا چەند شیرینە و ئەم باڵاپۆشییەش چەند ئاسودە بەخشە بۆ خودی خوشكان.

**ئەم پرسیارانە كران لە خوشكانی باڵاپۆش:**

**ژیانی پێش باڵاپۆشیت چۆن بوو؟**

١ _ خوشكێكی بەڕێز لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ووتی: پێشەكی بە ناوی خوا، پێش ئەوەی ببمە بالاپۆش هەمیشە وا هەستم دەكرد سەرپێچی یەكێك لە فەرمانەكانی خوا دەكەم، وە كاتێك دوعایەكم دەكرد هەستم بە شەرمەزاری دەكرد بەرامبەر بە خوا كەسەرپێچی دەكەم و داواشی لێدەكەم

٢_ خوشكێكی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە: ژیانم بەبێ حیجاب وەك كەسێكی بێ ناسنامە وابوو، كەسێك گوزارشت لە ناخی خۆی بكات و تەمەنێكی كەمی هەبێت.

٣ _ خوشكێكی تریش بەم شێوازە وەڵامی داینەوە: ئەتوانم بڵێم ژیانی پێش بالاپۆشیم هەروا بە فیڕۆ ڕۆیشت و هیچ سودێكم لێ نەبینی چونكە هەر وەكو بێهۆشێك كە چۆن مادەی سڕكەری بەكار هێنابێت و ئاگای لە خۆی و دەوروبەری نەبووبێ وە هیچ حیسابێكم بۆ كەس نەدەكرد تەنها بۆخۆشییەكانی دونیا هەوڵم دەدا وە زۆر زۆر لاوازیش بوو لە نوێژكردن و نزا كردنم و ڕوو كردنە خوای گەورە.

٤ _ خوشكێكی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی: لە كاتی ڕابردووم فەلسەفەی ژیانم بە گرنگ نەدەزانی، یاریم بەكات دەكرد هەروام دەزانی ژیان خەو و خواردن و خواردنەوەیە .

**ئەی ئێستا هەست بەچی دەکەیت دوای ئەوەی بوویتە بالاپۆش؟**

١ _ ئەم خوشکە بەڕێزە لە وەلامدا ووتی:

ئەوەی ئێستا هەستی پێدەکەم هەرگیز ناتوانم لەم دوو دێڕەدا دەری ببڕم، بەلام دەتوانم هەست بە سەربەرزی و پارێزراوی و نزیک بوونەوەم بکەم لە خوای گەورە، وە هەمیشە دلم ئاسودەیە .

٢ _ خوشکێکی تر لە وەلامدا ووتی: وا هەست دەکەم کەسێکی پەرژین کراو و پارێزراو و پوخت و خاوێن نموونە بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوا وَ ئیسراحەتێکی دەروونی ڕێنماییم دەکات تا دەروونێکی دلنیام هەبێت، متمانەم بە خۆم و تاجەکەم هەیە .

٣ _ خوشکێکی تر بەم شێوازە وەلا می داینەوە و ووتی:

هەست بە ئازادی دەکەم لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕوی دەروونییەوە ئێستا قەلەق نیم جاران زۆر قەلەق بووم پێش ئەوەی بڕیار بدەم، وە لە ڕووی مامەلە و هەلسوکەوت کردنم لە گەل خۆم و دەروونم، بۆ نموونە پێش-بالاپۆشیم نەمدەتوانی بە هیچ شێوەیەک جم و جوڵ بکەم بە ئازادییانە هەر دەبوایە خۆم داپۆشیایەوە و بەرگی خۆم چاک بکردایە، کە دەچوومەوە مالەوە شەوانە بیرم لە ڕۆژانی خۆم دەکردەوە زۆر نا ئارام و دل تەنگ دەبووم بەلام دوای بڕیاردانم کە بالاپۆش بم لە هەموو ئەو نائارامی و دل تەنگییە ڕزگارم بوو .

٤ _ خوشکێکی تر لە وەڵامدا ووتی:

ئێستا بۆم دەرکەوتووە ئیسلام تەواوی مافەکانی دابین کردووە، وەک نیعمەتێکی گەورە، کە حیجاب وەک ڕەمزێکی ئیسلام بۆ ئافرەت کە بتوانم پارێزگاری لێبکەم و بیپۆشم، وە گرنگی و بەهای کاتم بۆ دەرکەوتووە کە لەوە و پێش هیچی لێ فێر نەبووم.

٥ _خوشکێکی تریش لە وەڵامدا ووتی: سوپاس بۆ خوای گەورە کە هیدایەتی دام وە سوپاس بۆ ئەو کەسانەش کە پشتگیرییان لێکردم، بەڕاستی ئێستا زۆر مورتاحم و دڵخۆشم دوای ئەوەی بووم بە بالاپۆش، ئەمەش لە فەزڵی خوای گەورەوەیە چونکە هەر کەسێک فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکات بەڕاستی هەنگاو دەنێ بەرەو ژیانێکی خۆشتر لەوەی کە پێشتر تێیدا دەژیا.

**چی وای لێکردی ئەم بڕیارە گەورە و پیرۆزە بدەیت؟**

١ _ خوشکێکی بەڕێز بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە و ووتی:

زیاتر خوێندنەوەی کتێب وگوێگرتن لە ووتاری مامۆستایان، لە مانەش گرنگتر هاورێی چاك وخواناس وایان لێکردم ئەم بریارە بدەم.

٢_ لە بەرئەوەی دایکم پێشرەوم بوو بۆ کاری باش، وە لە بەرئەوەی کە دەمزانی حیجاب ئەرکێکی فەرزکراوە لە سەر هەموو ئافرەتێکی موسڵمان .

٣_ من وەکوخودی خۆم نوێژم دەکرد ڕۆژووم دەگرت بەڵام زۆر بە پتەوی نا، تا نوێژێکم دەکرد دووانم نە دەکرد هۆکاری ئەم لاوازی و سەر پێچییەشم ئەوە بوو کە هەستم دەکرد خۆم بە خۆمم دەوت هەرچییەک بکەم بیکەڵکە بۆنموونە زۆرجار شەوانە کە نوێژم دەکرد و قورئانم دەخوێند هەستێکی زۆر سەیرم لادروست دەبوو وا هەستم دەکرد کە تەواو ئەمجارە من یەقینم ڕێی ڕاستم هەڵبژاردووە بەڵام کە بە یانی دەهات خۆمم دەگۆڕی بە جوانترین شێوە سەر و قژم پەخشان دەکرد، دەتوانم بە خۆم بڵێم لەو حاڵەتەدا من درۆزن بووم، وا هەستێک هەبوو لە ناخمدا بانگی دەکردم بۆ ئەوەی خۆم داپۆشم وە هەموو کات سەرزەنشتی خۆمم دەکرد، دەمووت خودای گەورە ئەو هەموو شتە جوان و بەنرخەی پێ بەخشیوم بەڵام من سە ر پێچی لە فەرمانی ئەودا دەکەم وە زۆرجار دەچوومە بەرئاوێنە وام دادەنا کە چاوێکم لە دەست داوە یاخود قژم پێوە نەماوە ئەوەش زۆری دەترساندم لێرەدا خۆمم دەترساند بۆئەوەی نرخی بەخششە بەنرخەکانی خودای گەورە لە بیر نەکەم، بەڵام ئەوەی کە زۆر کاری تێکردم (مردن بوو)، لە رۆژێکدا کە بە جوانترین شێوە خۆمم گۆڕی بوو بەرێکەوتم بەرەو زانکۆ دایکم دووسێ ڕۆژ لای خوشکەکانم ڕەخنەی لە جل و بە رگم گرتبوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە منی ووت بۆئە وەی من دلگران نە بم، ڕۆژێکیان کە چوومە دەرەوە بۆ زانکۆ دایکم نووستبوو هیچی نە بوو دوای دوو سەعات و نیوو کە گەڕامەوە ماڵەوە بەسەر جەستەی ساردوسڕی دایکم ڕۆیشتمەوە، ئەمە ئاگادار کردنەوەیەکی

زۆر زۆر گرنگ بوو بۆ ئەوەی بەخۆمدا بچمەوە و خوای گەورە بۆی دەرخستم کە دونیا خەویکی کورتە هەرچۆنیک بێت هەر تەواو دەبێت، بەڵام ئیستا دەڵیم خۆزگەم بەوەی کە بەسەرفرازی دەچێتە بەردەم پەروەردگار و کردەوە خراپەکانی شەرمەزاری ناکات .

٤_ ئەم خوشکە بەڕێزەش لە وەڵامدا ووتی: لەبەرئەم هۆکارانە:

یەکەم: نا ئاسودە بووم لەژیان لە یەکە بە یەکەی چرکەی هەناسەکانم.

دووەم: گەورەترین ئامانجم لێوونبوو، نەبوونی هەڵوێستم بەرامبەر بە بەندایەتیکردنم بۆخودای تاك کە ئەویش رزگاربوونە لەئازارەکانی دۆزەخ و شادبونمە بە بەهەشت.

سێیەم: یەکلایی کردنەوەی خودی خۆم، کە من تەنیا خودام دەوێ تا پارێزگاریم لە ڕەوشتی ئیسلامەتیم بکەم و هەڵوێستم بۆ دەوروبەرم بدرکێنم .

٥_ ئەم خوشکە بەڕێزەش بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی:

ئاشکرایە کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لە سورەتی الأحزاب لەئایەتی (٥٩) ئاماژەی بۆکردووە، وە زۆر ئاشکرایە کە ئەمە فەرمانی خودای گەورەیە دیاریشە ئەوەی جێبەجێی بکات پاداشت وەردەگرێت، ئەوەیشی پشتی تێبکات سزا

وەردەگرێت لە سەری، هەرکەسێک کە فە رمانی خودا جێبەجێ بکات لە بەرژەوەندی خۆیەتی چونکە بە ڕاستی خوای گەورە هیچ مەجبور بە کردەوەی بەندەی وەکو ئێمەی گوناهبار نییە، بەڵکو ئەوەی دەیکات بۆخۆیەتی، بۆ پاراستنی هەردوو دنیای هەوڵدەدات، بۆیە منیش ئەو بڕیارەمدا لە ترسی گەورەیی و سزای خوای گەورە، ئەم ژیانە کەمەی دونیا بە هەرجۆری بێ هەر دەچێتە سەر، بەڵام ئەی لەو دونیا چۆن جوابی ئە و خوایەم بدابایەوە چۆن لەسزای ئەو دونیا نەجاتم دەبوو.

**تا چەند باڵاپۆشی ڕێگربووە لە بە دەستهێنانی هیواو ئاواتەکانت؟**

١ _ خوشکێکی بەڕێز لە وەڵامی پرسیارەکەماندا ووتی: هیچ دژایەتیەکم لەنێوان باڵاپۆشی و ئاواتەکانمدا بەدی نەکردووە و هیچ ئاواتێکم نییە دژبێت بەباڵاپۆشی.

٢_خوشکێکی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی: ڕێگری لە بە دەستهێنانی هیوا و ئاواتەکانمدا بەهۆی باڵاپۆشییمەوە ڕووی نەداوە لەژیانمدا لەبەرئەوەی مرۆڤێکی موسڵمان بووم، کامڵ بووم بە حیجابەکەم، ئەگەر ئەوە نەبووایە بە شێکم کەم دەبوو.

٣ _ خوشکێکی تر لە وەڵامدا ووتی: باڵاپۆشی هیچ کات ڕێگر نەبووە لە بەدەستهێنانی خەونەکانم، بگرە هۆکارێکی یارمەتیدەر بووە بۆ بەدیهێنانی خەونەکانم .

٤ _ خوشکێکی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی: هەرگیز باڵاپۆشی نەبووەتە هۆی ڕێگرتن لە دەستهێنانی حە و ئاواتەکانم، بەڵکو خۆی بە دەستهێنانی حەزێکە و پشت بەستنە بە خۆت .

٥ _ خوێنکارێکی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی:

بە پێچەوانەوە باڵاپۆشی ڕێگایەکە بۆ هەنگاو نانت بەرە و هیوا و ئاواتەکانت، من لەژیانی تایبەتی خۆمدا وای دەبینم، من زۆر هیوام هەبوو کە جاران دەم ووت ئەستەمە بێتە دی بەڵام زۆر سوپاس بۆ خوای گەورە ئەو هیوایانەم هاتە دی و یەکێک لەو هیوایەتانەی ژیانم ئەوەبوو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ببمە باڵاپۆش.

**ئایا ئازادی لە باڵاپۆشی دایە یان نا؟ چۆن؟**

١ _ ئەم خوشکە بەڕێزە لە وەڵامدا ووتی:

بەڵێ تا ڕادەیەکی زۆر ئازادیم وەرگرتووە لەبەرئەوەی هەست بە بوونم دەکەم، دروستبوونی ئەم بوونەوەرە بێ حیکمەت نییە و بەڕێزی خۆمم بۆ دەردەکەوێت کە خوای گەورە ئەم ڕێزەی بەخشیوەتە مرۆڤ وەک دەفەرموێت:

{وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي ءَادَمَ} [الإسراء ٧٠]

ئازادیم لە وەوە پەیدابووە کە تەنها پشتم بە خوا بەستووە وەک دەفەرموێت: ((و من يتوكل على الله فهو حسبه)) .

٢ _ خوشکێشکەی بەڕێزیش بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی:

من لە بالاپۆشیدا ئازادی زیاتر بەدی دەکەم، چونکە نا کەویتە بەر توانج و قسەوقسەلۆک، بالاپۆشیم گوزارشتە لە ئازادی بیروڕام.

٣ _ خوێنكارێكی تر بەم شێوازە وەڵامی خۆی خستە ڕوو و ووتی:

تێگەیشتنی من بۆ بالاپۆشی ئەوەیە کە فێری ئازادی کردم لە ناخمدا و وە لەژیانمدا، وە هەست بە سەربەرزی و خۆشییەکی زۆر لە ڕادەبەدەر دەکەم، تێدەگەم کە فەرمانی خوای گەورە و جێبەجێ کردنی خۆی لە خۆیدا ئازادییە و هەر کەسێکیش نەیکات ئەو خۆشی و ئازادییە نابینێت.

٤ _ بەڵێ ئەو ئازادییەی لە بالاپۆشیدا هەیە بڕوا ناکەم لە هیچ شتێکی تردا هەبێت، بالاپۆشی لە زۆرشتی نابەجێ ڕزگارت دەکات، مرۆڤیش کە ڕزگاری بوو لە نارەحەتییەک وە بە کردنی کارێک ڕزگاری بوو واتە ئازادی لەو کارەدایە کە کردوویەتی، کاتێک هەستام بە کردنی ئەم کارە دەتوانم بڵێم لە زۆرشت ڕزگارم بوو وەک:

یەکەم / لە سەر زەنشتی ناخ ودەروونم چونکە من پێش ئەوەی بڕیار بدەم هەمووشەوێک لەگەڵ خۆمدا دا دەنیشتم و بڕیارم پێنەدەدرا لەبەر هەندێ شتی دونیایی، بۆ نموونە دەم ووت جوانترین شت کە لە مندا هەیە سەر و قژ و بەژن و

باڵامە ناتوانم دایپۆشم چونکە لە جوانیم کەم دەکات، هەروەها هاوڕێکانم ئیتر لە گەڵم هەڵناسوڕێن چونکە کەسیان باڵاپۆش نین، بەڵام بەکردنی (حیجاب ) لە هەموو ئەو قەلەقی و نا ئارامییە ڕزگارم بوو.

دووەم/ ئازادی لە ڕووی کۆمەڵایەتی بەڕاستی من پێش باڵاپۆسی هەندێ بەرگی کورت و تا بلێیت نەشیاوم لەبەر دەکرد ئەمیش وای کردبوو هەمیشە جێگای سەرنج بم، ڕۆژی دەیان جار قسەی ناشرین و توانجم لێدەدرا، بەڕاستی نەمدەوێرا بە شوێنێکدا بڕۆم کە گەنج و پیاوی لێ بێت، بەڵام لە خودا بەزیادبێت ئێستا زۆر سەربەستم ئەصڵەن گوێم لە هیچ ووشەیەکی ناشرین و توانجێکی لار و ووشەی نابەجێ نییە، وە زۆر جار خۆشحاڵم بەوەی کە لە بازاڕدا ئافرەتی بەتەمەن یاخود گەنجی هاوتەمەنی خۆم دەبینم بە لەچکەوە پیاما هەڵدەدەن، زۆر جار دەمگرن و پێم دەڵێن لە چکەکەت زۆر جوانە یاخود دەڵێن فێرمان بکە با وەک تۆ بین، ئەوەی لێی دەترسام لە دەستی بدەم پێش لە چک کردنم زۆر بە خۆشحاڵییەوە بۆم هاتە دی.

ە _ خۆشکێکی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی: بەڵێ ئازادی لە باڵاپۆشیدایە، من لە ژیانی خۆم ئێستا هەستی پێ دەکەم، وە بەر جەستەشم کردووە لە زۆر لایەنی ژیانم.

**دوای ئـەوەی بوویتـە بالاپـۆش کەسـانی دەورو بـەرت چـۆن مامەڵەیـان لەگـەڵ کـردی؟ ئـەی پێـش بالاپۆشـیت چـۆن بـوون؟**

١ _ ئەم خوشکە بەڕێزە لە وەڵامدا ووتی:

لەبەرئـەوەی تەمەنـم بچـوك بـوو ڕووبـەڕوی ڕەتکردنـەوە بوومـەوە لە لایەنی جیاوازەوە، بەڵام هانی دایکم و حیجابەکەم بینـای حیجابیـان بـە شـێوازێکی قـووڵ لـە ناخمـدا داکوتـا.

٢ _ خوشکێکی تر بەم شێوازە وەڵامی داینەوە و ووتی:

پێـش بالاپۆشـیم هەنـدێ هاوڕێـم هەبـوو کـە، زۆریـان خۆشدەویسـتم و بـەردەوام بەیەکـەوە بوویـن. هاوڕێیەکـی زۆر تایبەتیـم هەبـوو بـە حوکمـی ئـەوەی کـە دراوسـێ بوویـن لـە منداڵییـەوە پێکـەوە بوویـن، زۆر پێکـەوە بوویـن بـە قـەدەر برایەکم خۆشـم دەویسـت، بەڵام ئـەو ڕۆژەی لەچکم بەسـەرەوە بـوو لـە زانکـۆ منـی دی لێـی پرسـیم ئـەو سـەر پۆشـە چییـە بەسـەرتەوە؟ وەڵامـم دایـەو ووتـم پیرۆزبایـم لـێ بکـە، چەرخەکـەی لـە گیرفانـی دەرهێنـاو ووتـی ئێسـتا سـەر و قژتـی پێـوە دەسـووتێنم، مـن زۆرم پێناخـۆش بـوو کـە وای کـرد، بـۆ چەنـد مانگێـك لـە خـۆ خواردنـەوەدا بوویـن و قسـەمان لەگـەڵ یەکتـر نەدەکـرد، ئـەو بەدڵـی نەبـوو کـە لەچـك بکـەم، بەڵام مـن تێـم گەیانـد کـە لەچـك شـتێکی جوانـە، ئەگـەر بەنـرخ نەبوایـە و بـۆ پاراسـتنی ئێمـەی ئافرەت نەبوایـە خـوای گـەورە فـەرزی نەدەکـرد، سـوێند بـە خـوا وام لێکـرد ووتـی مـادام وایـە کـە زەواجـم کـرد دەبێـت ئافرەتێکـی بالاپـۆش بهێنـم، سـوپاس بـۆ خـوا کـە زەواجـی کـرد لەگـەڵ یەکێکـی

باڵاپۆشدا کردی، ئێستا تەواو لە گەڵمدا گۆڕاوە زۆر لە جاران پەیوەندیمان باشترە، وە سوپاس بۆ خودا دوای بوونم بە حیجاب زۆربەی هاوڕێکانم سەرپۆشیاندا بە سەریاندا بەوە زۆر خۆشحال بووم ئەوەندەی تر لەچکم لا شیرین بوو، وە من زۆر تووشی نارەحەتی بووم لەگەڵ خوشک و براکانم دا نەیاندەویست لەچک بکەم بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا تەواو بیر و بۆچوونیان گۆڕاوە تەنانەت ئەندامانی خێزانەکەم وردە وردە لە چکیان کرد یەکێک لەوانە (( خوشکەزاکەم )).

٣ _ خوشکێکی تر لە وەڵامدا ووتی: بێگومان ئەگەر فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکەیت لای خوای گەورە خۆشەویست دەبیت و خەڵک و دەوروبەرەکەشت خۆشیان دەوێت و ڕێزت دەگرن، من ئێستا زۆر هەست بە گۆڕانکاری دەکەم لە ژیانی خۆمدا، کەسانێکی زۆر پیرۆزبایم لێدەکەن و زۆر لە جاران زیاتر ڕێزم لێدەگرن بەتایبەتی دایک و باوکم زۆر خۆشحاڵ بوون، ئێستا مامەڵیان زۆر لە جاران لە گەڵمدا باشترە و منیان لە خوشک و براکانم زیاتر خۆش دەوێت، هەروەها هاوڕێکانم لە زانکۆش زۆر زیاتر لە جاران ڕێزم دەگرن هاوکاریم دەکەن.

**پەیامت چییە بۆ ئەو خوشکانەی دەیانەوێ ببنە باڵاپۆش بەڵام ناتوانن جێبەجێی بکەن؟**

١ _ ئەم خوشکە بەڕێزە لە وەڵامی پرسیارەکەماندا ووتی: بیری لە ڕابردووی خۆتان بکەنەوە بزانن چ سودێکتان بینیوە تا ئێستا لە سەرپێچی کردنی ئەم فەرمانە؟ ئەگەر دەتەوێت

ئاسودەیی دنیا و ئاخیرەت بیت ئەوا ببە بە بالاپۆش، دلنیاتان دەکەمەوە تا خۆتان لەو واقیعەدا نەبن ناتوانن شیرینی ئیمان و بالاپۆشی بچەژن.

٢ _ خوشکێکی تر لە وەلامدا ووتی: داوام وایە بە بڕوایەکی پتەو و بەقەناعەتەوە بڕیاری خۆیان بدەن و لە هیچ شتێک نەترسن چونکە ئاسودەیی لە دوایە.

٣ _ خوشکێکی تریش لە وەلامدا ووتی: پێیان دەلێم: ئەمە یەکێکە لە فەرمانەکانی خوا پێویستە پەیڕەوی بکەین، بۆئەوەی لێمان خۆشبێت، چونکە هەمووومان دەمرین .

٤ _ خوشکێکی تر لە وەلامدا ووتی: خوشکەکانم چاوەڕێی چی دەکەن؟ فێل لەکێ دەکەن؟ ئایا ئەمری دروستکارەکەتان ڕەتدەکەنەوە یان دەروونی خۆتان ڕازی دەکەن، دەروون و ئارەزووی خۆت فرێدە ملکەچبە بۆ ئەمری بەدیهێنەرەکەت، ئەو لە تۆ زاناترە بە خۆت ودەزانێت چی سودی هەیە بۆت.

٥ _ خوشکێکی تر لە وەلامدا ووتی: منیش جاران کەسێک بوو وەک ئەوانەی باسیان دەکەیت، بەو خوشکە بەڕێزانەم دەلێم هەرچی زووە هەنگاو بنێن بەرەو بالاپۆشی، بڕوابکەن ژیانتان زۆر خۆشتر دەبێ و زۆر بەڕێزتر و بە گەورەتر تر دەبن لە ناو کۆمەلگاش، یان بیربکەنەوە ئەو تەمەنەی بەڕێتان کردووە چ قازانجێکتان لێ کردووە؟ یاخود لەو جلانەی کە لەبەری دەکەن؟ منیش وەک ئێوە بووم دەم ووت هەرگیز ناتوانم و نازانم و چی و چی ..... بیانووم زۆر بوو بەلام

بڕوابکەن ئەو قسانە هەموو خۆ خافڵاندن و فێڵ لە خۆ کردنە، تا ئەو جلە پیرۆزە لەبەر نەکەیت نازانی تامی بالاپۆشی لە چیدایە، خۆشتان نازانن ژیانتان چۆن دەگۆڕێ بە یارمەتی خوای گەورە.

خوشکی بەڕێز و خۆشەویستم نووسین و لێدوانی چەندین خوشکی ترمان لە بەر دەستدابوو بۆ ئەوەی ئاماژەی پێ بکەین، بەڵام وا هەست دەکەم ئەمەندە بەس بێت بۆ بەڕێزت کە بیکەی بە هۆکاری هیدایەتت، بۆ خۆت خوێنتەوە ئەو نوسراو و دەستەواژانە کە چۆن سفورییەت و نەپۆشینی حیجاب ژیانی ئەو خوشکانەی پڕ کردبوو لە تاڵی و ترشی، نارەحەتی تەنگی پێ هەڵچنی بوون، بەڵام کاتێک تاجی حیجابیان نایە سەر چۆن ئەو حیجابە پیرۆزە ئاسودەیی و شادمانی کردە دیاری بۆ دڵیان، خوشکی ئازیزم دڵنیابە ژمارەی کاروانچیانی بەرەو حیجاب چوون ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە، بە پێی سەرژمێرییەک کە لە هەندێک شوێنی کوردستاندا کراوە ژمارەی ئەو خوشکانەی کە هەڵگری ئەم تاجە زێرینەن لەساڵی ( ٢٠٠٦ ) ەوە تا بەرواری نووسینی ئەم بابەتە زیاتر لە ( ٣٧٣٠ ) خوشک بوون[1]

---

(١) ئەم سەر ژمێرییە هی چەند شوێنێک و چەند کەسێکی کەمبوو، وە لە چاپی دووەمدا ئاماژەمان پێکردووە.

## جا بۆیە پێت دەڵێم

ئەی خوشکەکەم چاک ووریابە و گوێم بۆ بگرە

تاکو ئێستا تاوانت کرد بەڵام لێرە پەتی ببڕە

تەمەنت ڕۆی بەفیڕۆ چوو پێم ناڵێی لەپێناوی چی؟

لە دواڕۆژ کەلێیان پرسی لەوەڵامدا تۆ دەڵێی چی؟

تەمەنت بۆ خوای گەورەبوو یاخود بۆغەیری ئەو

بەبێ حیجاب هاتی و ڕۆیشتی بە ڕۆژو شەو

ئاخر چ بەهانەیەکە بۆخۆتت کردوتە لەبەر

هەر کارێ کە خوا فەرزی کا بۆقازانجی تۆیە بەشەر

بەجوانییەکەت مەنازە جوانی تاسەر نەبوو بۆکەس

کە چویتە ناو گۆڕیشەوە لەگەڵدا نییە هیچ کەس

بەزانست و زانیارییەکەت هیچ کات لەخۆت مەبە بایی

چونکە سیفەتی شەیتانە سەرت دەخوات ڕۆژی دوایی

لاشەت تاوانی زۆری کرد ئیتر هیچکە مەدە بە کوڵ

ئەو لاشەیەت لەژێر خاکدا لە کۆتایی دەبێ بە خۆڵ

دەبەسییەلاسایی کردنەوە و پۆشینی پۆشاکی غەربی

لەلای خۆی تۆ موسوڵمانی دەبوو دایم دژ بە ئەو بی

مادام تۆ ئیمانت هەیە دە ئیمانەکەت تەواو کە

چونکە پۆشینی حیجابیش بەشێکە لەییانەکە
بەڵام خوشکی خۆشەویستم هەرچەن زۆرت کرد بێ تاوان
بەڵام هەرگیز نائومێد مەبە لەمیهر و بەزەیی ڕەحمان

وەرە خوشکی موسوڵمانم ئەی گوڵە جوانەکەی کۆمەڵگا
دەستەکانت بەرزکەوە بۆلای قاپی و بارەگای خوا
بەدڵێکی پڕ لە کوڵ و بەچاوی پڕلەسرینەوە
داوای لێخۆش بوون لەخواکە بەناخی پڕ برینەوە
بڵێ: ئەی خوای گەورە شەرمەزاری بارەگاتم
دەگەڕێمەوە بۆلای تۆ بڵێ وابەرەو ڕوت هاتم
خەجاڵەتی خۆت دەر ببڕە بۆ ئەو خودا گەورەیە
ئەویش نائومێدت ناکات چونکە گەلێک لێبووردەیە
خۆی فەرمویە بەندەکانم لەمیهرم نائومێد مەبن
ئەو لەگوناهتان خۆش دەبێت گەر وەک کەفی سەر دەریاش بن
جا کەوایە ئەی خوشکەکەم لەبەر چی تۆ تەوبە ناکەی؟
بەگەڕانەوەت بۆلای خوا خۆت لەئاگر پێ ڕزگارکەی
بەزەلیلی و بەداماوی بە خەمۆکی و بەنزاوە
بەڕێکەوە بەرەو دەرگای سۆزو بەزەیی خوداوە

ئەو دەرگایە هەر هی ئەوە هەرگیز داناخرێ لەهیچ کەس

دەبگەڕێوە بۆ لای خوا تاکەی تاوان دەبەسە بەس

بەسەر شۆڕی و پەشیمانی بۆ لای خوا بگەڕێرەوە

ژیانێکی تازە دەست پێ بکە دە پەیمانت نوێکەرەوە

دەنگی گریە و نالەنالت بۆلای ئەو خوایە هەڵ□ببڕە

پەتی دڵڕەقی و ئینکاری هەر لە ئێستاوە ببڕە

خوشکەکەم زۆرم پێ ووتی چاوم وەختە بێنە گریان

بەڵام نازانم و لەبەرچی دڵی تۆ نەهاتە گۆڕان

من بۆتۆمە ئەم داوایە هەمان کات بۆخێری خۆشم

گەر بۆقازانجی تۆ نەبێ من بۆچی وا بە پەرۆشم

ئەی خوشکەکەم من زۆر سکم بەتۆ دەسوتێ

دەوابکە کەلاشەت بەئاگری دۆزەخ نەسووتێ

دوا ووتەشم هەر ئەوەیە دەنگم هەڵدەبڕم بۆلای خواوە

ساخوایە خوشکانمان هیدایەت دەی بەدڵێکی دامەزراوە

# مەرجەکانی باڵاپۆشی

یەکەم/ دەبێت پۆشاکەکە هەموو لاشەت داپۆشێت جگە لەدەست و دەم وچاوت هەر وەک خوای گەورە دەفەرموێت:

{ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا } [النور ٣١]

واتە: (بازینەت وجوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەوەی بۆ خۆی بەبێ مەبەستی ئەوان دەردەکەوێ) زۆربەی زانایان فەرموویانە ئەوەی کە، بۆ خۆی دەردەکەوێ دەست و دەم و چاوە دەستیش تەنها مەچەک کە بۆ خۆی دیارە و مۆڵەتی پێدراوە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:

{ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ } [النور ٣١]

واتە: (با لەچکەکانیان شۆڕبکەنەوە بەسەر فەتحەی کراسەکانیان) بەداخەوە زۆرێک لەخوشکان سەرپۆش دەکەن و لەگەردنیاندا گرێ لەلەچکەکانیان نادەن.

**دووەم/** دەبێت پۆشاکەکە تەنک نەبێت واتە دەبێت ئەستور بێت، چونکە داپۆشین کاتێک دێتە جێ کە ئەو شتەی دایدەپۆشێت واتە داپۆشراوەکە دیار نەمێنێ کە ئەوەش دەبێت قوماشێکی ئەستور بێت، بەڵام ئەگەر پێچەوانە بوو ئەوا زیاتر ئافرەتەکە بەرەو فیتنە دەبات چونکە زیاتر دەیڕازێنێتەوە.

**سێیەم/** دەبێت پۆشاکەکە تەسک نەبێت و فراوان بێت، چونکە مەبەست لەپۆشاک نەهێشتنی فیتنەیە ئەمەش بەبێ پۆشاکی ئەستور نایەتەدی، چونکە پۆشاکی تەسک هەرچەندە لاشەش داپۆشێ و بیشارێتەوە بەڵام قەبارە و شێوازی لاشە دەردەخات ئەمەش دەبێتە هۆی چاوتێبڕینی بەرامبەر وە سەر دەکێشێت بۆ خراپە بۆیە دەبێت فراوان بێت.

**چوارەم/** نابێت پۆشاکەکە لەپۆشاکی پیاوان بچێت چونکە (أبو هورەیرە) ﴿رضي الله عنه﴾ دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ کەفەرمویەتی: نەفرین لەو پیاوانەی کەپۆشاکی ئافرەتان لەبەر دەکەن و وەنەفرین لەو ئافرەتانەی کەپۆشاکی پیاوان لەبەر دەکەن بۆیە نابێت ئافرەتان و پیاوان خۆیان بچوێنن بەیەکتری .

**پێنجەم/** نابێت پۆشاکەکەت سەرنج ڕاکێش و بریقەدار بێ چونکە ئەگەر پۆشاکەکە ڕازێنرابۆوە سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێ .

**شەشەم/** نابێت پۆشاکەکە لەپۆشاکی بێباوەڕان بچێت چونکە بۆ هیچ موسوڵمانێک پیاو بێت یان ئافرەت دروست نییە خۆی بشوبهێنێ بەبێباوەڕان چونکە پێغەمبەر﴿صلى الله عليه وسلم﴾ دەفەرموێت:

(مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ)[1] واتە:(هەر کەسێک خۆی بچوێنێت بەهەر قەومێک ئەوە لەوانە) .

**حەوتەم/** نابێت پۆشاکەکە بۆندار بێت، چونکە بۆن کاریگەری خۆی هەیە جا نەخوازە ئافرەت لەخۆی بدات، بۆیە بۆن بۆ ئافرەتان حەرامە، چونکە سەرنجی پیاوان بۆلای خۆیان ڕادەکێشن، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:

(أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فهي زَانِيَة)[2]

واتە:(هەر ئافرەتێک خۆی بۆندار بکات بەلای کۆمەڵە پیاوێکدا بڕوات تابۆنی بکەن ئەوە ئەو ئافرەتە زینای کردووە) .

**هەشتەم/** نابێت پۆشاکەکە بۆناو و شۆرەت و ناوبانگ لەبەر بکرێت چونکە عبدللەی کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر (ﷺ) کەفەرموویەتی (هەر کەسێک پۆشاک و جل و بەرگ بۆ شۆرەت لەبەر کات ئەوا خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا بەرگی زەلیلی لەبەر دەکات پاشان ئاگری تێبەر دەدرێت بڵێسە دەسێنێ) .



(١) رواه أبو داود رقم (٤٠٣١).وقال شيخ الألباني صحيحه

(٢) رواه أبوداود(٤١٧٣) و الترمذي(٢٧٨٦) والنسائي(٥١٢٦) وقال شيخ الألباني حديث حسن

# پەیامێکی گرنگ و پێویست بۆ ئەو خوشکانەی کە باڵاپۆشن

ئەو خوشکە ئازیز و خۆشەویستانەی کە باڵاپۆشن و ( حیجاب )یان کردووەتە کاڵای باڵایان، چەند بابەتێکی گرنگ هەن کە زۆر بە پێویستی دەزانم بۆیان ڕوون بکرێتەوە، بۆ ئەوەی هەنگاوی هەڵە هەڵنەگرن و تووشی بە هەڵە تێگەیشتن نەبن و، وە بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ پۆشاکەکەیاندا بکەن، ئەو بابەتانەش وا لە خوارەوە بە چەند خاڵێک ئاماژەی پێدەکەم:

١ _ مرۆڤی موسڵمان کاتێک دەیەوێت کارێکی چاکە ئەنجام بدات یاخود پێویستییەک لە پێویستییەکانی ئایین بەجێبهێنێت، دەبێت دڵسۆز بێت لە کارەکەیدا، واتە دەبێت نیەتی تەنها لەبەر خودا بێت، تۆ کە حیجاب دەپۆشیت دەبێت لەبەر خاتری خودا بیپۆشیت و وەکو پێویستییەکی دین بیپۆشیت، نەک لەبەر عادەت و کلتوری کۆمەڵگاکەت یاخود لەبەر جوانی یان لەبەر ئەوەی کەسێکی نزیکت پێی خۆشە یان لەبەر ئەوەی هاوڕێکانت دەیپۆشن تۆش پێت شەرم بێت نەیپۆشیت، و چاویان لێبکەیت، خوای گەورە عیبادەتی بەم شێوەیەی ناوێت.

دەبێت تۆ لە ناخی دڵتەوە بڕیاری کۆتاییت دابێت کە لە پێناوی ڕەزامەندی و خۆشەویستی پەروەردگار حیجاب بپۆشیت. ئەی ئەگەر خوانەخواستە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەوانەی کە تۆ چاوت لێکردوون ڕوویان کردە سفوری و پشتیان لە دینەکەی خوا کرد، دووبارە تۆش چاویان لێدەکەیتەوە؟!! بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداری بڕیار دانت بیت، دەبێت بزانیت بە چ نییەتێک و بۆ چ مەبەستێک خوا پەرستی دەکەیت چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ((إنما الأعمال بالنيات وإنما لكل امرئ ما نوى ))[1]

٢ _ خاڵێکی تر کە زۆر پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە ئافرەتانێکی زۆر هەن کە سوپاس بۆ خوای گەورە باڵاپۆشن و زۆر وا بەستەن بە حیجابەکەیانەوە بەڵام زۆر بە داخەوە لە لایەنی عەقیدە و بیروباوەڕەوە زۆر کز و لاوازن، باوەڕیان بە زۆر شتی خەیاڵی و خورافیات هەیە، پەنا بۆ زۆرشت دەبەن کە هەمووی شیرک و هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوا وەک ئەوەی لە کاتی نەخۆشکەوتن یاخود منداڵ نەبوون یان لە کاتی تەنگانە و ناخۆشی و ناڕەحەتیدا هاوار بۆ غەیری خوا دەکەن و دەچنە سەر شەخس و گۆڕی پیاو چاکان، لە جیاتی ئەوەی هانا بۆ خوا بەرن و داوا لە خوای گەورە بکەن، ئەم جۆرە کارانە زۆر لە سفوری و زینا خراپتر و گوناهترن، جا کە تۆ بیر و باوەڕت بەم شێوازە بێت باوەڕت بە کەسێکی مردوو بێت کە بە هاناتەوە بێت، حیجابەکەت چ سوودێکی دەبێت بۆت کە پۆشیوتە، بۆ ئەوەی خوای گەورە لێت وەر بگرێت خوای گەورە دەفەرموێت:

(١) _ رواه البخاري، ومسلم وغيرهما

{ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا } [النساء ٤٨]

واتە: (بە ڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بە ڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە).

خوای گەورە عەقیدە و بیر و باوەڕی لە هەموو شتێک بە لاوە گرنگترە، هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:{ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ } [المائدة ٧٢]

واتە: (ئەوەی شەریک و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لە سەر حەرامکردووە، شوێن و جێگا و سەرئەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەو ستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نییە کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت)، تۆ کە عەقیدە و بیر و باوەڕت جێگیر نەبوو بەو شێوەیەی کە، خوای گەورە دەیەوێت، عیبادەتەکانی ترت سودیان نابێت بۆت، چونکە گەورەترین تاوان لای خوای گەورە هاوەڵ بڕیاردانە بۆی، گەورەترین ستەمە لای وەک دەفەرموێت:

{ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ } [لقمان ١٣]

واتە: (بە ڕاستی هاوتا و هاوبەش بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورە و نارەوایە)

٣ _ خاڵێکی تر کە بە پێویستی دەزانم بخرێتە ڕوو، فەرزی (نوێژ ) ە، زۆرن لەو خوشکانەی کە بالاپۆشن، بەلام بە داخەوە کارێکی تر کە زۆر کەم و کورِی تێدا ئەنجام دەدەن نوێژ کردنە. من نالێم نوێژ ناکەن بەلام زۆر کەم و کورتن تێیدا، بە تایبەتی لە نوێژی بەیانیاندا هەروەها نوێژەکانی تریش کەلەوانەیە لەبەر چەند هۆیەکی دنیایی کە عوزر نییە بۆیان نوێژەکانیان بفەوتێنن، ئاخر چۆن دەبێت و دەگونجێت تۆ بالاپۆش بیت و نوێژ بفەوتێنیت خۆ نەکردنی نوێژ لە نەپۆشینی حیجاب گوناهتر و ترسناکترە، نوێژ گەورەترین عیبادەتە لە ئیسلامدا کۆلەکەی دینەکەتەدەبێت نوێژت لە ڕووناکی چاوەکانت خۆشتر بوێت، بۆیە دەبێت چۆن ئاگاداری حیجابەکەتی و نایەڵیت نامەحرەم بەسفوری چاوی پێت بکەوێت، دەبێت زۆر لەوە زیاتر ئاگاداری نوێژەکانت بیت.

٤ _ بەڕاستی جێگای داخ و ئەسەفە کە هەندێک لەو خوشکانەی بالاپۆشن، هەڵس و کەوتێک دەنوێنن کە نەدەبوو هی ئەوان بێ کە من پەش بەحاڵی خۆم خەفەتی پێ دەخۆم، بۆ نموونە خوشکی بالاپۆشی وا هەیە زۆر بەدەم کورانەوە پێدەکەنێت قسەکردنی زۆر و بەتەنیا لە گەڵیان زۆر بە ئاسایی دەزانێت. نموونەیەکی تر لەوانە چەندین ئافرەتی بالاپۆش دەچنە ناو ئاهەنگی بێشەرعی لە ناو بۆنەو ئاهەنگی بێشەرعی دەبینرێن یان هەندێک لە خوشکان وازیان لە سفوری هێناوە بەلام بەداخەوە وازیان لە گوێگرتن لە گۆرانی و زنجیرە ئەڵقە و موسەلسەلاتە بێ شەرعی و ئابڕووبەرەکان نەهێناوە. خوشکە بالاپۆش و بەحەشم و حەیاکەم ڕاستە دەبێت حیجاب بپۆشی

چونکە لە بەرئەوەی فەرزە بەلام لەوە گرنگتر و فەرزتر ئەوەیە کە کاری پێ بکەی دەبێت ئەو پۆشاکە لە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و مامەڵەتدا ڕەنگ بداتەوە دەبێت ئاوێنەی ژیانت بێت.

٥_ یەکێکی تر لەو هەڵانەی کە بالاپۆشان تێیکەوتن بە داخەوە بریتییە لە برۆ کردن کە پێغەمبەری خوا ( سەلامی خوای لەسەر ) نەفرەتی لێکردون کە دەفەرموویت ((لعن الله النامصە و المتنمصە ))[1] واتە )) نەفرەتی خوا لەو کەسەی کە برۆ دەکات و لەوەش کە بۆی دەکات )) کە ئەمە بە ڕاستی جێگای داخ و ئەسەفە، کە پێویستە بە زووترین کات واز لەو کارە بێنن و خۆیان لە نەفرەتی خودا بپارێزن .

٦ _ خاڵێکی تر ئەوەیە کەمی شارەزایی لە ئایین و دووری لە زانستی شەرعی، بە داخەوە ئەمرۆ لە کۆمەڵگای ئێمە گشت چین و توێژێکمان دوور کەوتوینەتەوە لە وەرگرتنی زانستی شەرعی، لەم خاڵەشدا ئافرەتانمان لە هەرە چینی خوارەوەن بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداری ئایینەکەمان بین چونکە ڕاسپاردەیەکە لەسەر شانمان ئەم ئایینە وا بە ئاسانی بە ئێمە نەگەیشتووە، تا وا بە سانا وسادەیی لێی بڕوانین، ئێمە بۆ ماوەی ١٦ _١٨ ساڵ دەخوێنین لە ناوەندەکانی خوێندندا، کەچی کاتێک ورد دەبینەوە هیچی وامان بە دەست نەهێناوە لە چاو ئەو هەموو ساڵەی کە تیماندا سەرف کردووە، بەلام ئامادە نین نەک ئەوەندە ساڵە تەنانەت چەن مانگێکیش تەرخان بکەین بۆ شارەزایی لە ئایینەکەمان کە پێویستییەکی

شەرعییە چونكە ئەوانەی كە لە ژیاندا تێناكەون ئەوانەن كە شارەزان و زانستیان پێیە و كار بە زانستەكەیان دەكەن، بۆیە پێویستە بە گوڕ و تینێكی زۆرەوە جارێكی تر بگەڕێینەوە بۆ وەرگرتنی زانستی شەرعی و شارەزاییمان بۆ ئایینەكەمان، ئەمەش بەتایبەتیتر بۆ ئافرەتان چونكە زانستی شەرعی هەوێنێكی پاڵفتەیە تابەهۆیەوە ئافرەتی موسڵمان منداڵەكانی پەروەردەبكات ئەوسا نەوەیەكی گۆشكراوی ڕێبازو ڕێسایەكی جوان كە ئیسلامە لەدایک دەبێت.

٧ _ بابەتێک هەیە كە زۆر كات ئافرەتان سەركەوتوو نابن تێیدا، ئەویش لە بەرهەمی دونیا ویستی و بە گەورە سەیر كردنی دونیاوەیە، وە ئافرەتانی بالاپۆشیش بێبەش نەبوون لەم سەر نەكەوتنە، ئەویش ( پڕۆسەی هاوسەرگیرییە )، هەندێک لە خوشكانی بالاپۆش هەن كە زۆر بە هەڵە لەم بابەتە تێگەیشتوون و، زۆر بە هەڵەش بڕیار دەدەن لەگەڵ كەسانێكدا هاوسەرگیری دەكەن كە، بە داخەوە لە لایەنی دین و ئیمانەوە زۆر لاوازن، بەس تەنها لە بەر ئەوەی گەنجێكی جوانە و چاو و برۆیەكی جوانی هەیە و، قەد و بالایەكی رێكی هەیە و خاوەنی بڕوانامەی بەرزەو سەروەت و سامانێكی زۆریشی لە ژێر دەستدایە، ئامادەن هاوسەرگیری لەگەڵدا بكەن. تۆیەک كە خۆت داپۆشیوە بە پۆشاكی ئیسلام و هەوڵتداوە خوا لە خۆت ڕازی بكەیت، بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ كەسێكدا دەكەیت كە هیچ ئینتیمایەكی نەبێت بۆ ئایینەكەت كە هیچ یارمەتیدەرێكت نەبێت بۆ سەرخستنی ئایینەكەت، تۆ كە چەندین ساڵە لە هەوڵ و ماندو بووندای بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوای گەورە

بە دەستبهێنیت و بەختەوەری دونیا و دوارۆژ بۆ خۆت دەستەبەر بکەیت، بۆ لەگەڵ کەسێکدا ژیان پێک دەهێنیت کە ئەم هەموو شتە جوان و گرانبەهایەی چەندین ساڵە قوربانیت بۆ داوە و خۆتت پێوە ماندوو کردووە بەهۆی ئەو کەسەوە لە دەست بدەی، تەنها لەبەر خاتری ئەوەی کە خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆرە و ئامادەیە هەموو سەروەت و سامانەکەی ببەخشێت بە تۆ و هەموو شتێکت بۆ بکات، لە کاتێکدا کە سەروەت و سامانەکەی تۆ دین و ئیمانەکەتە، هەموو شتێکی تۆ پیرۆزییەکانی دینەکەتە، بۆ ئەو کەسە دەکەیتە ئاگر بۆ سووتانی خەرمانی کۆکراوەی چەندین ساڵەت. بۆیە خوشکە ئازیز و خۆشەویستەکانم زۆر ئاگادار بن لەم مەسەلەیەدا، چونکە بابەتێکی زۆر گرنگە نابێت بە باق و بریقی دونیا هەڵبخەڵەتێن.

٨ _ ئەم خاڵەشیان هەر لە سەر مەسەلەی هاوسەرگیرییە بۆ ئەو خوشکانەی کە بالاپۆشن، زۆرن لەو خوشکانەی کە بالاپۆشن کاتێک کە داوای هاوسەرگیرییان لەگەڵ دەکرێت بۆ کەسێک دەڵێن مەرجمان تەنها دین و ڕەوشتی کەسەکەیە و هیچی تر کە ئەمە بناغەیەکی زۆر جوان و ڕێکوپێکە،ئەو بناغەیە کە، پێغەمبەر(ﷺ) دایناوە، بەڵام بە داخەوە کاتێک کە کوڕێک داوای هاوسەرگیرییان لەگەڵدا دەکات بۆ خۆیان دان بە چاکی و باشی و ڕێکوپێکی کوڕەکە دادەنێن، هیچ کەمو کورییەکی ئەو تۆ نابینن لە لایەنی دین و ڕەوشتەوە لە کوڕەکە، بەڵکو لەوانەیە زۆر جار باسی کار و کردەوە باشەکانی کوڕەکەش بکەن بەڵام کۆمەڵێک بڕو بیانوو دەهێننەوە کە لە

ڕاستیدا حەیف و جێگای داخە بۆ هەڵوەشاندن و سەر نەگرتنی پرۆسەکە، زۆر جار ئەو بەهانەیە دێننەوە کە کوڕەکە لەوانەیە یەک دوو ساڵ یان سێ ساڵ بچووکتر بێت لە ئافرەتەکە، یاخود کوڕەکە دەوڵەمەند نەبێت بۆیە پێی ڕازی نابێت یاخود زۆر جار ئافرەتەکە زۆر بە ژیرانە بڕیار دەدات و ڕازی دەبێت بەڵام ئەوەی دەبێتە بەربەست و سەرنەگرتن و لێک ترازانی کارەکە، داواکارییە زۆرەکانی ئافرەتەکەیە وەکو ( مارەییەکی زۆر، ماڵ لە سەر مۆدیل، داوا کردنی ئۆتۆمبیل، یاخود لە هەموو گرانتر و سەختتر گواستنەوەی کوڕەکە لە شوێنی نیشتەجێبونی خۆی بۆ شوێنی نیشتەجێبونی ئافرەتەکە ) ئەمانە وا لە کوڕەکە دەکات کە ئەو ئافرەتەی لەبەر خاتری خودا هەڵبژاردبوو، دین و ڕەوشتی بۆ کردبووە بناغە بە ناچاری دەستبەرداری بێت و وازی لێبهێنێت و هاوسەرگیری لەگەڵ نەکات بەهۆی داواکارییە زۆرەکانی ئافرەتەکە تەنانەت زۆر جار بڕیاری هەڵەش بە کوڕان دەدات، ئەویش هاوسەرگیری نەکردنە بۆ هەتا هەتایە، بۆیە ئاگاداربە ئەی خوشکی ئازیزم کاتێک کە کوڕێک دێتە پێشەوە بۆ ئەوەی هاوسەرگیریت لەگەڵ ئەنجام بدات وە دەزانی لەبەر ئەوە هەڵبژاردوی کە بالاپۆشی و وابەستەی بە دینەوە، وە هەمان سیفەتی دین و ئیمانیش لە ئەودا هەیە بۆ بۆ چەند شتێکی دونیایی کەسێکی وا لە دەست خۆت دەدەیت، ئەوە بزانە ئەو تۆ لە دەست نادات تۆ ئەو لە دەست دەدەیت، چونکە تۆ هۆکاری بۆ هەڵوەشاندنەوەی کارەکە ئەو کوڕە لەوانەیە ڕۆژگارێک بێتە پێشەوە خوای گەورە ئافرەتێکی زۆر لە تۆ چاکتری بە نسیب

بکات و ئەم داواکارییە زۆرانەی تۆش نەهێنیتە پێش، بەڵام ئەی ئایا ناترسی تۆ لە بەرامبەر ئەم کارەت زڵلەی میهرەبانی پەروەردگارت بەرکەوێت و کەسێکی تر هاوسەرگیریت لەگەڵ بکات کە سیفەتەکانی کەسی یەکەمجار تییدا زۆر بە کەمی دەست بکەوێتەوە، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم کە ئاگاداربە تۆ کەسێک بۆ لە دەست دەدەی کە، دەزانی ڕەزامەندی پەروەردگار لەگەڵیدا بەدەست دێنیت. تۆ خواو دواڕۆژی خۆت بۆ دەگۆڕیتەوە بۆ چەند شتێکی کەمی دونیایی

وەکو لوقمانی حەکیم دەفەرمووێت:( دونیا بۆ خۆی کەمە، ئێمەش کەمێکمان لەو کەمە بەر کەوتووە، وە ئەو کەمەش کەمێکی لێماوەتەوە ) ئاگادآربە خۆشییەکانی ئەم دونیایە هەمووی لاوەکی و کاتین جوانییەکەی، دەوڵەمەندییەکەی، تەمەنەکەی و گشت شتەکانی تر کۆتاییان پێدێت. ووتەیەکی زۆر جوان هەیە دەڵێت: ( باوەش کردن بەم دنیایەدا هەڵە کردنە، چونکە دونیا فلیمێکە کۆتا هەڵقەی مردنە )، بۆیە لە دواین دەستەواژەی ئەم خاڵەدا پێت دەڵێم: "ئاگاداربە مرۆڤێک لە دەست نەدەی کە لەوانەیە قەدەر جارێکی تر پێتی نەبەخشێتەوە" .

٩ _ بابەتێکی تری پێویست لایەنی ( پەروەردە ) یە، پەروەردە کردنی منداڵ ئەمڕۆ لەکۆمەڵگای ئێمەدا لە گەورەترین قەیراندایە بابەتێکە کە پەراوێز خراوە نە بە گرنگییەوە باسی لێدەکرێت و نەوەکو پێویستیش کاری بۆ دەکرێت، ئەی خوشکی بالاپۆشم ئەو منداڵەی کە ئەمڕۆ خودا پێی داوی یان ان شا و اللە لە

داهاتوودا پێت دەبەخشێت پێویستە زۆر ئاگاداری پەروەردە کردن و گەورە کردنی بیت، ئاگاداربە لە پێناو دەوامکردنت لە فەرمانگەیەکی حوکمی بۆ پەیدا کردنی چەند مووچەیەکی کەم یان زۆر پەروەردەی منداڵەکەت لە بیر نەچێتەوە ئەمڕۆ کۆمەڵگەکەمان کە لەگشت بوارەکاندا کەوتووەتە قەیرانەوە یەکێک لە گەورەترین هۆکارەکان نەبوونی پەروەردەیەکی تەندروستە، باوەڕ بکە لە ژێر خێمەیەکدا بژیت و نان و ئاوی ووشک بخۆیت لە پێناو جوان پەروەردەکردنی منداڵەکانت زۆر سەر بەرزانەتر و گەورەتر بۆت کە لە خانووی سێ قات دابیت و هەموو ژەمیکیشت پارووی چەور بێت بەلام نەوەیەکی پڕ ئاشوب و شەڕانگێز بخەیتەوە. خوشکی ئازیزم خۆتان بە کەم مەزانن ئێوە مامۆستای پەروەردە کردنن دەبێت وا لە دەوروبەرتان بکەن چاوتان لێکەن و پرستان پێبکەن و لێتان فێربن، ئێوەن کە دەتوانن کۆمەڵگاکەمان هوشیار کەنەوە و سەر لەنوێ دروستی کەنەوە، هەر ئێوەن کە، دەتوانن ئەوەی خراپە چاکی کەنەوە، ئەوەی ڕوخاوە بینای کەنەوە، ئەوەی بڵاوە کۆی بکەنەوە، ئەوەی لایداوە ڕاستی کەنەوە بە بەخشینی پەروەردەی جوان بە نەوەکانتان. بێگومان هەموو کارێکیش زانست و لێزانینی خۆی دەوێت بۆیە پێویستە لە بواری پەروەردە کردنیش خۆمان دەوڵەمەند و شارەزا بکەین هەروەک لە خاڵی پێنجەم ئاماژەم پێکرد دەبێت شارەزاییمان زیاتر فراوان بکەین، زیاتر خۆمان پڕ چەک بکەین بە زانست و زانیاری بۆ ئەوەی بتوانین هەنگاوی باش هەڵگرین لە بواری پەروەردەدا، وە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾

زۆر بە جوانی باس لە پەروەردەکردنی منداڵ کراوە دەبێت ئاگاداری تەمەنی نەوەکانمان بین، چونکە هەر قوناغێک و هەر تەمەنێک جۆرێکی تایبەت لە پەروەردە کردن و مامەڵە کردنی پێویستە بۆیە جارێکی تر پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شارەزایی لە ئایینەکەمان.

١٠ _ کۆتا تێبینی و کۆتا خاڵم ئەوەیە ئەمانەی باسمان کرد کاتێک دەتوانین جێبەجێیان بکەین کە دەست بەرداری حەز و ئارەزووە دونیاییەکانی نێو دڵمان بین و خۆمان تەرخان بکەین بۆ خزمەت کردنی ئایین و گەل و وولاتمان، هەروەها بەردەوام و دامەزرا و بین و دەست بگرین بە هۆکارەکانی دامەزراوی و دانەبڕوای لەوانە هاوڕێی چاک و خوێندنەوەی کتێبی باش و بیرکردنەوە لە تەمەنی ڕۆیشتوومان و نزیک بوونەوەی مردنمان، هەروەها بیر کردنەوە لە ژیانی گۆڕ و ڕۆژی دوایی، تەرازووی قیامەت و سەر پردی سیرات و خۆشییەکانی بەهەشت و ئازارەکانی دوزەخ، تامەزرۆیی گەیشتن بە هاوەڵان و پێغەمبەر(ﷺ)، نۆشینی ئاوی کەوسەر و لە سەرو هەمووشیانەوە شادبونمان بە دیداری خوای گەورە.

# دوایەمین وێستگا مردن

بیرت نەچێ خوشکەکەم بەر لەوەی چاوەکانت بوچەند چرکەیەک داخەی ڕۆژێک دێت بۆ هەتا هەتایی چاوت لەم دونیا دادەخەیت و ماڵئاوایی لە شتە ڕەنگاو ڕەنگەکانی دونیا دەکەیت، ڕۆژێک دێت مردن دەبێتە میوانت هەرگیز دەرباز بوونت نییە، سەیر لەوەدایە لە پڕێکا دێت بێ ئەوەی مۆڵەتت بدا خۆی ئەکا بەژووراو، باکی نییە میوانت هەبێ یان تاقی کردنەوە یان فلیمی ئەمڕۆت لەدەست دەچێ دەبێت لەگەڵییا بڕۆیت، لەگەڵ کێ؟ لەگەڵ فریشتەی گیان کیشان (ملک الموت)، پەروەردگار کاتی زۆری پێبەخشی بەڵام نەتتوانی بەباشی بەکاری بهێنی بۆیە کاتت بەسەر چوو هەروەک و کاتی تاقی کردنەوەی قوتابخانە کاتەکەت بەسەر چوو دەفتەرەکەی بەر دەستت لێ دەسێنن،

بەڵام تاقی کردنەوەی قوتابخانە قەرەبوو دەکرێتەوە و دەرفەتێکی ترو تاقی کردنەوەیەکی ترت لەپێشە بۆ دەرچوون هیچ نەبێ بە درێژایی ساڵی خوێندن کاتت لە پێشە، بەڵام

دەڵیت: ئەی نەوەی ئادەم تاوان دەکەیت لەسەر پشتم بەڵام دەبێت سزاکەی بچێژی لەناو سکمدا .

هاتنی مردن بەکەسایەتی و کات و سات نییە منداڵ بێ یان گەورە، کچ بێ یاخود کور، هەژاربێ یاخود دەوڵەمەند، دەسەلاتداربێ یاخود بێدەسەلات، قازانجی مامەڵەکەی دەست کەوتبێ یاخود نا، بۆ دواجار ئازیزەکەی خۆی بینیبێ یاخود نا، لەسەرت ناوەستی لەکاتی خۆیدا هەر هەمووی دەبێت بچێژیت تامی مردن، ئەی نەت پرسیوە خوشکی بەڕێزم هەر لەم دونیا دوای مردن چیت لێدێت؟ ئەو دەم و چاوەی ڕۆژانە چەند جار لەبەر ئاوێنە تەماشات دەکرد نە با گەردێک یان پەڵەیەک یان تەنیکی بێگانە لەسەری نیشتبێت و ناشرینی کردبێت، بەڵام ئەوەتا لەناو خاکدا کرمەکان بەبێ منەت زانین کردویانە بەخۆراکی خۆیان، بەڕاستی خۆراکێکی گرانبەهایە بۆ ئەوان، چونکە بە جوانی دونیا ڕازێنراوەتەوە و خانەکانی پڕکراوە لەمادەی جۆرا و جۆری ئارایشت و جوانکاری دەست کرد، حەیف سەدان حەیف بۆ تۆ خوشکەکەم کەوا جرو جانەوەرەکانی ناو خاکیش بۆ ئەو تەمەنە کورتە خۆراکی خۆیان دەست کەوت لە ڕوخسار و لەشولاری تۆ، کە، چی تۆ هیچ خۆراکێکت نەخستە توێشووەکەتەوە بۆڕێگە دوور و درێژەکەی ڕۆژیی دوایی.

با لەکۆتایی ئەم گەشتەدا پرسیارێک لەخۆمان بکەین، کێ سەر کەوتووە لەو ڕۆژەی کە مردن یەخەی دەگرێت؟ ئەوکەسەی کە بەدوای هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی کەوتووە و گوێی



بەحەرام و حەلال نەداوە؟ یان ئەو كەسەی كە بە كردەوەی باش و بەندایەتی بۆ خوا كردن و خۆپاریزی لە هەواو ئارەزووە شەیتانیانیەكان، خۆی بۆ مردن ئامادە كردووە؟ خۆت سەر پشك بە لەوەلامەكەی كامیانت بەسەركەوت و زانی تۆش وەك ئەوكە .

خوشكی بەڕێزم مۆدێلاتی دونیا وای لی كردوویت گوی بۆ ئەم قسانەم نەگریت و بەقسەم نەكەیت چونكە دڵت پیی تەنگ دەبێت وانییە؟ ناحەقت نییە، چونكە دڵی خۆت پەردەپۆش كردووە بەهەواو ئارەزووە سادەكان، ئارەزووی خۆتە گوێم بۆ دەگریت و بە قسەم دەكەیت یان نا بەلام دڵنیابە مردن ڕۆژێك دێت بە سەرتا لەوانەشە بڵێی هێشتا گەنجم تاپیر دەبم خوا كەریمە ئەوكاتە خۆم بۆ مردن ئامادە دەكەم، بەلام چاك بزانە ئەم قسانە لەدڵێكی دڵسۆزانەوە دەخەمە بەر گوێت زۆر گەنج شەو خەوتن لە خەیاڵدابوون بەیانی هەستن و دەستی بۆكە قەشەنگەكەیان بگرن و ژیان دروست بكەن بەلام چۆن خەوتن جارێكی تر هەڵنەستانەوە، ئاگاداربە ئەوە مردنە مردن .



# خوشکەکەم دەرگای بەزەیی پەروەردگار کراوەیە بۆت

خوشکی ئازیزم.... دەرگای بەخشندەیی و میهرەبانی خودا.... دەرگای سۆز و بەزەیی پەروەردگار لە سەر پشتە، ئەو دەرگایەی کە خوا گیان بەڕووی هیچ بەندەیەک لە بەندەکانی دانەخستووە و بۆ بەندەکانی کردووەتەوە ئەو دەرگایەی کە ڕۆژانە بە سەدان بەندە لە بەندەکانی پەروەردگار ڕێگەی کاروانیان گرتووەتە بەر و بەڕێدەکەون بەرە و ئەو دەرگا فراوان و پان و بەرینە، بە دڵێکی پڕ لە کول و بە چاوی پڕ ئەسرینەوە دەستەکانیان بەرەو بارەگای پەروەردگار هەڵدەبڕن و بە دروشمی ((پەشیمانم ئەی خودایە من گەڕامەوە بۆلات)) یەکەم هەنگاویان دەنێن، خواگیانیش بەو پەڕی خۆشەویستی و دلۆڤانییەوە باڵی ڕەحمەتی بۆ ڕاخستون و فەرمویان لی دەکات و بەرە و پیریان دێت، بەڵکو لەلای پەروەردگار زۆر خۆشەویست و پلە بەرزترن لە کەسانێک کە تەقوادارن......... بڕوا بکە خوشکەکەم ئەگەر کەسێک بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بە شەو شەونوێژ بکات و قورئان

بخوێنێت و خۆی بە دوور بگرێت لە گوناهو تاوان بەندەیەکی تەقواداری دامەزراو بێت، ئەمە کەسێکە پەروەردگار زۆر زۆری خۆش دەوێت، وە ئەگەر کەسێک تاوانێکی زۆری کردبێت لە هەموو جۆرە تاوانێک هەر لە شیرک و داوێن پیسی و نوێژ نەکردن و ئیهانە کردنی ئیسلام و سفوری و چەندەها تاوانی تر، بەلام ئەگەر ئەو کەسە تاوانبارە تەوبە و پەشیمانییەکی ڕاست بەرامبەر پەروەردگاری دەرببڕێت و واز لە تاوان بهێنێت ئەوا ئەم کەسە تەوبەکارە پلەی لەو کەسە بەرزترە لای پەروەردگاری کە عیبادەتێکی زۆر دەکات و تەقوادارە. بڕوا بکە خوشکە بە شەرم و حەیاکەم خوای گەورە خراپەکانی ئەو تەوبەکارە هەمووی دەگۆڕێت بە کردەوەی چاک هەروەکو بۆ خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

{ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا } [الفرقان ٧٠]

واتە: (( مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کار و کردەوەی چاک ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کاروکردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بۆ چاکە، چونکە هەمیشەو بەردەوام خوالێخۆشبوو میهرەبانە ( بەرامبەر خەڵکی بەگشتی و وە ئەو جۆرە کەسانە بە تایبەتی ) )) ئەها بەزەیی پەروەردگار چەندە فراوانە سەیرکە پەروەردگار لەو هەموو هێز و دەسەلاتەیدایە، لەو هەموو دەولەمەندییەدایە کە هیچ پێویستییەکی بە من و تۆ نییە بەلام ئەو ئێمەی خۆش دەوێت ڕێزی لێمان ناوە بە پیرمانەوە دێت. بیرکەرەوە

لە ژیانتدا کەسیک هەبووە بەو شیوەیە تۆی خۆش بویت، کەسیک هەبووە ئا بەو چەشنە لە هەلە و کەم و کورییەکانت ببوریت و پلەیەکی زۆر بەرزت پی ببەخشیت، چی تاوان و خراپەی کردووشتە بوت بگوریت بۆ خیر و چاکە ئەوەی نائومیدی و رەشبینی بیت بەرامبەر بەوەی ئایا لیت خۆش دەبیت یان نا لە هزر و بیروبۆچوندا نەهیلیت ئەوەتا خواگیان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویت:

{ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ } [الزمر ٥٣]

واتە: ((ئەی پیغەمبەر ﷺ پییان بلی:خوا دەفەرموویت: ئەی بەندەکانم ... ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەی زۆرتان ئەنجام داوە نائومید مەبن لە رەحمەتی خوا، (چونکە بەراستی ئیوە ئەگەر تەوبەی راست و دروست بکەن) خوا لە هەموو هەڵە و گوناهەکانتان خۆش دەبیت، چونکە بەراستی ئەو خوایە لیخۆشبوو و لیبوردەیە و بەسۆز و میهرەبانیشە)) بروا بکە خوشکەکەم خوای گەورە ئەوەی زۆر پیناخۆشترە لە تاوانەکانت ئەگەر بیت و نائ ومید و رەش بین بیت بەرامبەر بە سۆز و بەزەیی پەروەردگار و بلیی خوا لیم خۆش نابیت.

خوشکی ئازیزم ...... شەیتان ئەگەر تاوانیکی ئیجگارەزۆری پی کردوی و ئەو هەموو تەمەنە جوانەی پی بە زایە داویت، مەهیلە ئەم تاوانەشت پی بکات و ئەم هەلەت لە دەست بدات و بیتە ناو میشک و دلتەوە و، پیت بلیت تۆ هیندە خراپەکاری و هیندەت تاوان کردووە مەجالی ئەوەی تیدا نەماوە خوای

گەورە لێت خۆش بێت. گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتەبگرە ئەی خۆشکی خۆشەویستم

لە سەردەمی حەزرەتی موسادا (سەلامی خوای لێبێت) ماوەیەک باران نەدەباری حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) پارایەوە لە خوای گەورە کە بارانیان بۆ ببارێنێت خوای گەورەش وەحی بۆ حەزرەتی موسا کرد (سەلامی خوای لێبێت) پێی فەرموو: ئەی موسا هەرچەند دوعا بکەیت بارانتان بۆ نابارێنم چونکە لە ناو ئومەتەکەتدا پیاوێکی تێدایە چل ساڵە دژایەتی من دەکات. تا ئەو پیاوە لە ناوتاندا نەڕوات بارانتان بۆ نابارێنم، حەزرەتی موساش (سەلامی خوای لێ بێت) ڕۆیشتەوە ناو خەڵکەکەو پێی فەرموون: خوای گەورە دەفەرموویت بارانتان بۆ نابارێنم، چونکە پیاوێکتان لە ناودایە چل دانە ساڵە دژایەتی من دەکات هەتا ئەو نەڕوات لە ناوتاندا بارانتان بۆ نابارێنم، ئا لەو کاتەی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەوەی بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە ئەو پیاوەش کە چل دانە ساڵ دژایەتی خوای کردبوو لە ناو خەڵکەکەدا بوو کە، حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەمەی بۆ گێڕانەوە پیاوەکە زانی کە خۆیەتی. دواتر خوای گەورە بارانی بۆ باراندن حەزرەتی موساش (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی ئەی خودایە خۆ هیچ کەسێک لە ناو ئومەتەکەم نەچووە دەرەوە ئەم بارانەت چۆن باراند؟ خوای گەورەش فەرمووی: ئەی موسا لەو کاتەدا کەتۆ باسەکەت بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە ئەو پیاوەی کە بۆ چل ساڵ دژایەتی دەکردم لە ناو خەڵکەکە دابوو، زانی ئەو پیاوە خۆیەتی بۆیە تەوبەی

کرد و گەڕایەوە لە تاوان کردن و وازی لە دژایەتی کردنم هێنا، حەزرەتی موساش (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی خودایە دەپێم بڵێ ئەو پیاوە کێیە با بیناسم، خوای گەورەش فەرمووی: ئەی موسا ئەوپیاوە بۆ ماوەی چل دانە ساڵ دژایەتی کردم ئابڕویم نەبرد، ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ لام دەتەوێت ئابڕوی بەرم، ئەوە کەسێکە تۆزێک لە پلەی پێغەمبەرایەتییەکەی تۆ پلەی کەمترە، ئەم بارانە ڕەحمەتەم لەبەر ئەو باراندووە.

ئالەم بەسەرهاتەوە زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کەسی تەوبەکار چەند خۆشەویستە......چەند ڕێزدارە......چ پلەو مەقامێکی هەیە لای پەروەردگار، وە خوای گەورە چەندە بەخشندە و میهرەبانە، سۆز و بەزیی خودا چەندە فراوانە، ئەوەتا ئەو پیاوەی کە چل ساڵ دژایەتی خوای کردبوو کاتێک تەوبەی کردوو گەڕایەوە جگە لەوەی کە خوای گەورە لێی خۆشبوو ئەو ڕێز و گەورەییەشی پێدا کە پلەکەی بە شێوەیەک بەرز کردەوە شتێک لە پلەی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موسا (سەلامی خولی لێ بێت) کەمتربوو، وە خوای گەورە کردییە هۆکاری دابەزین و هاتنە خوارەوەی بارانی پڕ ڕەحمەتی خۆی .

خوشکی ئازیزم ....... چ تێڕوانینێکت هەیە بۆ پلە بەرزی تەوبەکار؟....چ هەستێکت لەلا دروست دەبێت.بەرامبەر بە بەزەیی و میهرەبانی پەروەدگار؟ یان هیچ خوێندنەوەیەکت لە ناخدا دروست نەبووە بۆ ئەم بەها گرانەی تەوبەکار؟

یان إن شاء الله توش بە نیازی ببیت بە یەکێک لە کاروانچایانی ڕێگەی گەڕانەوە و تەوبەکاری.....وازهێنان لە تاوان و خراپەکاری ...... چەشتنی شیرینی ئیمان و ڕزگاربوون لە ژیانی پڕ دەردەداری.

بەڕاستی دل گوناە نەخۆشی دەخات تەنها تەوبە کردنیش دەتوانی چاکی بکاتەوە و لەو ونبوونەی ڕزگاری بکات، چونکە لە ئامێزی تەوبەدا دەتوانی تام و چێژی لیقای پەروەردگار بکەیت ئەو خوایەی ئەو پەروەردگارەی کە لە هەموو گوناهو تاوانێک خۆش دەبێت و تەوبەی بەندەکانی قبول دەکات، ئەو بەندانەی کە تالاوی دابڕان و دوور لە خوایی چوو بە گەرویاندا و سەرگەردانی کوچەو کۆلانە تاریکەکانی نائومێدی بوون، ئەو بەندانەی کە ڕوحیان تووشی قەیرانێکی گەورە بووە دەرگای ئاسودەیی و بەختەوەرییان لێ داخراوە، ئەو بەندانەی دوای ئەوەی بە تەواوی یەک پارچە تاریکاییان بە سەر دەروونی خۆیاندا هێناوە و خەریک بوو بە یەک لەحزەی کەم کۆتایی بە ژیانیان بێنن . .

تەوبە: دەرگای ئومێد و هیوای هەموو ئەوانەیە کە دەیانەوێ دوای تاقیکردنەوەی ئەزمونی دوور لە خوایی بێنەوە ئامێزی پڕ میهری خودا. پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دەرگای تەوبەی لە سەر دانەخستین و لەم شانۆیەی ژیاندا لە گۆشەیەکی زەمەندا فەرامۆشی نەکردین، کەواتە ئەی خوشکەکەم ژیان هیچ تام و لەزەتێکی نییە بەبێ تەوبە.

تەوبە: هەست و سۆزێکە کە نەخشەی ڕێگای هیوا بۆ مرۆڤ دەنەخشێنێت.

تەوبە: ڕزگارکەرێکە ڕزگارت دەکات لە کۆت و بەندی هەواو ئارەزووەکان، لە کەلەپچە و زنجیری ئارەزووە بێ بەهاکان.

تەوبە: ئەو کەشتییە ڕزگارکەرەیە کە لە ناو شەپۆلەکانی تاوان دەتبات بەرەو کەناری ئارامی و حەسانەوە.

تەوبە: لە هاوەڵێتی شەیتانی نەفرەت لێکراو جیات دەکاتەوە و پەروەردگار دەکات بە هاودەم و خۆشەوستی دڵت .

تەوبە: ئەو دڵەی کە کردبووتە گۆڕەپانی خراپەکاری و یاری کردن بە هەست و بەها جوانەکان، ئەو دڵەی کە بەهۆی تاوان و دوور لە خوایی کردبووتە شەوەزەنگی تاریکایی، تەوبە ئەو دڵەت بۆدەکات بە مەیدانی خۆشەویستی پەروەردگار، پڕی دەکات لە نوری هیدایەت و شەوقی ئیمان.

تەوبە: خەندەی سەر لێوەکان و لێدانی ئەو دڵانەیە کە لە حەسرەت و ئازاردا لەت بوون، چۆن لەت نەبێت! لە کاتێکدا تاوانەکانت لە نێوان تۆ و زاتێکدایە کە دەبینێ و ئاگاداری ورد و درشتی ئەو کارانەیە کە لاشەکەت ئەنجامی داوە و لە پەڕاوێکدا لەلای خۆی هەمووی نووسراوە و هیچ شتێکی لێنەپەڕێنراوە و هەمووی وەک خۆیان نووسراوەتەوە. بەڵام ئەو پەروەردگارێکی بەخشندە و بەلمیهرەبانە، کێ هەیە هێندەی ئەو بەخشندەبێت؟ لە کاتێکدا دروستکراوەکانی لێی یاخی دەبن و سەرپێچی لە فەرمانەکانی دەکەن، بەڵام ئەو



دەرگای لێخۆشبوونی خۆی هەر بە کراوەیی دەهێڵێتەوە، چاودێریان دەکات و ئاگای لێیان دەبێت، هەروەکو ئەوەی هیچ سەرپێچییەکیشیان لێ نەکردبێ، دەیانپارێزێ و کاروباریان بۆ هەڵدەسوڕێنێ وەکو ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان تاوانێکیان نەکردبێ.

**کێ هەیە داوای لێ کردبێ و پێی نەبەخشیبێ؟**

**کێ پێویستییەکی پێی هەبووە ئەو دەستی لێ بەردابێ؟**

**ئەی کێ لە دەرگای ڕەحمەتی ئەوی داوە و ئەو دەستی بە ڕووەوە نابێ؟**

بە تەنها ئەو خاوەنی سۆز و بەزەیی بێ پایانە و لە بەخشندەیی خۆیەوە لە تاوانباران خۆش دەبێ و وەڵامی ئەو دەستانە دەداتەوە کە بەرەو لای ئەو بەرزکراونەتەوە.

خوشکەکەم...... واز لە فرمێسکی بێ هیوایی بێنە، وەرە فرمێشکی خۆشی و شادمانی بڕێژە بۆ ئەم ژیانە تازەیەت، خێراکە و دەست پێشخەری بکە و تەوبەکەت دوا مەخە، پەلە بکە بەرلەوەی فرسەتت لە دەست چێت.

وەرە با پێکەوە گوێ بگرین بۆ چیرۆک و بەسەرهاتی ئەم خوشکە دوای ئەوەی ترش و تاڵی تاوانی چەشت و لە ناو زەلکاوی تاوان و خراپە تا ئاستی مەست بوون چەقیوە و دەروونی توانای نەما و ڕوحە ماندووەکەی زەنگی ئاگادار کردنەوەی لێدا تەوبەی کردووە و دەڵێت: (ویستم بمرم و

هەوڵمدا خۆم بکوژم، چەند دانە حەبێکم خوارد تووشی ژەهراوی بوون هاتم بەڵام نەمردم، دەمانچەی براکەم برد و هەموو شتێک ئامادەبوو بۆ ئەوەی لە مێشکی خۆمدا بەتاڵی بکەمەوە، بەڵام دایکم خێراتر لە پەنجەکانم گەیشتە سەرم و نەیهێشت بیتەقێنم. هەموو کات لە خۆم دەپرسی باشە بۆچی من ئەم ژیانەی خۆمم بە دڵ نییە؟ تا ئەو کاتەی لە شوێنی کارەکەم خوشکێکی باوەڕدارم ناسی. ئەم خوشکە لە قسەکانی بەردەوام دەبێ تا ئەو جێگەیەی دەڵێ: ئیتر دەستم کرد بە نوێژ و وازم هێنا لە تەلەفزیۆن و گۆرانی حەرام، وێنەکانی ژورەکەمم هەر هەمووی دڕاند و دەستبەرداری هەموو حەرامێک بووم، ئێستاش ئەوەتام لەسەر ئەو ڕێگەیەی کە بە یارمەتی خودا دۆزیومەتەوە و ژیانی پڕ لەخەمم پێ شاد کرد. ئەمە بوو ئەو شتەی کە بەدوایدا وێڵ بووم و ئومێدی دۆزینەوەیم دەکرد، هەرگیز بڕوام نەدەکرد ئەو ئارامیە دەروونیە گەورەیە لە نوێژدا بێت، خۆم تورە دەکرد لەو کەسانەی کە دەیان ووت: حیجاب دڵ دەکات بە شاری بەختەوەری، وامدەزانی بردنەوەی گرەوی دڵی خەڵکی و هەرزەکاران ئەو خۆشبەختیەم بۆ دەستە بەر دەکات. من نەمدەزانی هاوڕێکانم وایان تێگەیاندم هەر لە سەرەتاوە باسی دین و خوا و بەهەشت و دۆزەخ و حیجاب و هەموو شتێکی ئیسلامیان لا ناشرین کردم، بەڵام ئێستا ڕاستیم دۆزیوەتەوە، ئەمە ئەو مۆدێلەی ژیانە کە دەمەوێ بیکەمە پەیڕەو بۆ خۆم و لەسەری بڕۆم، ئیتر نامەوێ بگەڕێمەوە بەرەو دواوە، دەمەوێت خوا لە خۆم ڕازی بکەم و نەهێڵم تورەبێت. خوشکە دیندارەکانم فرمێسکەکانم یەک بە یەکیان

پڕن لە تام و چێژی خوا پەرستی و دەروونیشم نەسیمێکی پاکی ئەو تۆی تیا دەگەڕێ، لەوەتەی هاتوومەتە ئەم دنیایە هەناسەی وەهام هەڵنەمژیوە، نیگای چاوەکانیشم تەوبە و ترسی تەماشا کردنی حەرام کراوەکانی تیادا دەخوێنرێتەوە، من دەمەوێ تۆش بۆچوونی خۆتم پێ بڵێیت، بەڵام پێش ئەوەی هیچ بڕیارێکم بەسەردا بدەی، تکات لێدەکەم ئەوەت لە یاد بێ کە خوا تەوبە وەر دەگرێت و منیش بەندەیەکی تەوبەکارم، خوایش ئاگاداری ئەم قسەیەمە)).

خوشکە گیان ... ئەی گەوهەری کۆمەڵگاکەم... ئەی بەهادار و شەونمەکەی بەری بەیان .... داوات لێ دەکەم ئەم ڕازو نیازەم لێ وەرگریت. ئەمانە تەنها ووشە ڕیز کردن نین وە تەنها مەرەکەب سەرف کردن و پەڕەی سپی پڕکردنەوە نین، بەڵکو هەموو بۆ تۆن و بۆ خۆشی و شادی تۆن، مەگەر تۆ خۆشی و شادیت ناوێت؟

بۆ ئاسودەیی و کامەرانی تۆیە، بۆ ئارامی و حەسانەوەی تۆیە، مەگەر تۆ ئەمانەت ناوێت؟ بەدوایاندا وێڵ نیت؟ هەموو هەوڵ و کۆششێکی ژیانت بۆ ئەوە نەبووە کە ژیانێکی پڕ شادی و ئاسودەییت هەبێت؟ مەگەر نەتویستووە لەژێر سایە و سێبەری بەختەوەریدا بحەسێیتەوە؟ بێگومان وەڵامەکەت بەڵێ دەبێت.

ئەم نوسینانە ... ئەم ووشە و دەستەواژانە ... ئەم هەموو پەیڤە ڕەنگینانە دێن و دەیانەوێت ببنە هۆکاری ڕزگار بوونت، دەیانەوێت لەناو دەریای تاواندا هیچی تر مەلە نەکەیت،

دەیانەوێت پێی چەقیوت لەناو قوڕولیتەی تاواندا دەربهێنن و بتهێننەوە سەر ڕاستە شەقامی ژیان، نایانەوێت هیچکە لە بیابانی دور لە خوایی بەجێ بمێنیت، نایانەوێت هیچکە تۆ ژێر دەستەی هەواو نەفس و پلانە گلاوەکانی شەیتان بیت، بە جۆرێک کەتەلۆکێکی وای ژیانیان بە بەردا کردوی کە ئاوات بە مردن بخوازیت.

بڕوا بکە شەیتان نەخشە و پلانەکانی زۆر لاواز و بێ هێزن هەر وەکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت { إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا } [النساء ٧٦]

واتە: ((بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پوچ و لاوازە)) شەیتان هیچی پێ ناکرێت ئەگەر تۆ سەنگەری لێ بگریت، تۆ چەکی قورئانت پێیە، لە ناو شورای ئیمانداى، دەروازەی تەوبەت لە بەر دەمە، ئیتر چۆن شەیتان زاڵ دەبێت بەسەرتدا.

خوشکی ئازیز و خۆشەویستم من زۆرم بۆ نووسیت.... زۆرم پێ ووتیت، ئینجا نورەی تۆیە، ئەگەر تاکو ئێستا وەکو خوشکێک گوێگر بوویت ئەوا لە ئێستاش بە دواوە هەروەکو خوشکێکی بە وەفا پەیڕەویکە، کەش و هەوای ژیانت بگۆڕە و بەرنامەیەکی تازە بۆ ژیانت دابنێ، خۆری چەند ڕۆژ ئاوا بووە و بێ سەر و شوێن ماوە دڵی تۆ، چەند جار تاریکی شەو باڵی کێشاوە بەسەرتاو تۆ لە گوناهدا بوویت، دە ئێنجا ئیسراحەت بەو ڕوحە ماندووەت بدە، با ئازاری دەروونت هیچکە کڵپە نەکات و سوێی بێتەوە بۆ تەنها ساتێک ئارامی، دە بڕیارێکی تازە بۆ ژیانت بدە.



هەستەو ڕوت ڕووەو خودا و بنی و شەیتان وێل کە و ئیتر مەهێلە هیچکە توزێک ئومێدی خراپەی پێت هەبێت، هەستە و دوای مەخە با ئەم هەلەشت لە دەست نەچێت، برۆ دەست نوێژێکی جوانی بۆ بشۆ و بەرماڵەکەت ڕوکە قیبلە و دوو ڕکات نوێژی ( إستغفار ) ی بۆ بکە و دوای تەواو بوونی نوێژەکە دەستەکانت بەرە و بارەگای خوا بەرز کەوە و لە دەرگای سوز و میهرەبانی خوا بدە و دلنیاشبە ئەویش گوێی بۆ گرتوێت و وەرت دەگرێتەوە و، تەوبەت لێ قبول دەکات و قەلەمی لێخۆشبوونی خۆی بەسەر گشت تاوانەکانتدا دێنێت. بپاڕێرەوە لە خودا و بلێ: ئەی خوایە گیان ... تین و تاوی گوناهباری هێناومێتیە بەر دەرگای تۆ، ترسی گۆڕ و چارەنوسم بیری تۆی هێناومەتەوە بلێ: پەروەردگار لۆمە و سەرزەنشتی دەروونم پەلکێشی کردم بۆ لای تۆ و

ئاگری بەردایە دلم لە ترسی ڕۆژی دیداری تۆ، هێندە گریام خەریک بوو ئاوی چاوم دابێت.

ئاە .... خوایە گیان چەند گوناهبارم

بلێ: ئەی خوایە گیان ....

لەگەل شەیتان دا گەشتی هەموو تولە ڕێ و خراپەیەکم کردووە، تەنها ڕێگەی ڕاست نەبێ هیچی دەربارە نازانم.

ئیبلیس هەمیشە مامۆستام بووە و لە ڕیگا و کاروانی گومڕاییمدا هەر کاتێ ویستبێتم تەوبە بکەم پێی دەوتم: نەکەی تەوبە نەکەی خوا سەیری دل دەکات.

ئاه .. پەروەردگارا کوڵی خراپەم چەند قورسە ...

گومرای کردم ز خومی لی گوریم، لە خوبایی کردم، نەفسی سەرکەشم.

پەروەردگارا تو تەنها خوت دەرد و دەرمانی ئەم دلە بریندارەم دەزانی

خوایە گیان ئیستاش من هاتووم بو ئەوەی زەلیلی و گوناهباری خوم لەلای تو بەیان بکەم، هەموو گوشەکانی سەرگەردانی تەمەنی بەباچوی خومم وازلیهیناوە و خوم خستوتە ناو ئامیزی پاکیزەیی، ئیتر لەمرو بەدواوە چرکەیەکیش بەشەقامی سەرگەردانیدا ڕیناکەم.

پەروەردگارا .......

ئەی ئەو زاتەی وەلامی نزات لەلایە، ئەی پشتیوانی چارەڕەشان لیم ببوورە، من پەیمانم داوە، پەیمانی دلی ئیماندار بو لە مەودوا لە نیو تەسبیحات و نویژ و ڕوژوو و حیجابدا نەبی نەمبینی، دە ئەی خودایە وەرم بگرەوە

پەروەرینەکەم .....

تەمەنیکی زورم لە بیفەرمانی تودا ڕیکرد، لەناو کووچە و شەقامەکانی تاوان دا زور خولامەوە، ئەزموونیکی زورم تیپەڕاند لەناو ئەم گەشتەدا، بەلام پیچەوانەی ئەو ئەزموونەی کە تو دەتویست . ویستم لە گورانی و موسیقا و هەلپەڕکی دا ئاسوودەیی بەدەست بینم، زور بە دیار فلیم و زنجیرە و



ئەلقەکان دا دانیشتم و قەرزاربارى کات بوومەوە لەسەریان، بە ئامانجی ئەوەی بەختەوەری بۆ ڕۆحم دابین بکەم، ویستم لەو زنجیرە ئەلقانەوە ڕاستەقینەیی ژیان فێربم و مامەڵەی جوان لەگەڵ خەڵک بکەم، بەلام بە داخەوە ئەوان بوونە هۆی ئەوەی لە ژیانی ڕاستەقینە دەرم بێنن و لە جیاتی مامەڵەی جوان سووک و ناشرینیان کردم. لە بەرهەمی هەموو ئەو کارانەدا سفوری و بێ حیجابیی بوو بە ڕێچکەی ژیانم، پەیوەندی دروست کردن لە گەڵ کوڕان بە ناوی (خۆشەویستی) پێکەنین بە دەمیانەوە بە ناوی ئەوەی وەک (برا ) ی خۆم وایە، لەبەر کردنی جل و بەرگی ئەورووپی بەناوی (پێشکەوتن) بوو بە مۆدێلی ژیانم.

ئەمانەم هەموو کردن ....هەوڵ و کۆششی زۆرم بۆ دان تەنها بۆ ئەوەی شادی بۆ ڕۆحم بەدی بێنم، بەلام لە ڕێگەی هەموویان دا لە ڕووی هەموو ئەم کارانەدا دەرگای بەختەوەریم بە ڕوودا داخرا.

لە دەرگای هەر یەکێکیانم دا پێم ووت: هاتووم لەگەڵ تۆ دا بەختەوەر بم.

ووتی: لای من دەست ناکەوی، پێم ووت و داوای ئاسودەییم لی کرد، ووتی: من دژی ئەم چەمکەم .

ووتم: ئەی بۆ دەست کەوتنی خۆشی و شادی چ بکەم؟ ڕوو لە کوێ بکەم؟ ووتی: زۆر بەداخەوە سەرگەردان بووی من ئەو شتانەی تۆ دەست ناخەم، چونکە من دەرگایەکم،



ئیبلیســە دەرگەوانەکەم .

ئێستاکەش وا دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ ئەی دروستکارم، ئەی هەلسووڕێنەری ژیانم داوات لێ دەکەم کە لێم ببوری.

پەروەندەکەم....

گەر سۆز و بەزەیی تۆ نەبوایە، ڕووی پارانەوەم نەبوو لێت.

خوایە گیان .........

تۆ لەکەسێک خۆش بوویت و لێبووردنی خۆت کردە خەلات بۆی (١٠٠) دانە کەسی کوشتبوو، تۆ لە کەسێک ڕازی بووی کە تەنها سووجدەیەکی بۆ نەبردی و شەهیدیت کردە دیاری بۆی، سوپاس بۆتۆ خودایە کەمن هیچ کەسێک بە دەستەکانم نە کوژراوە، وە تەوبە و گەڕانەوەم بە نوێژکردن و سوجدەبردن بۆ تۆ دەست پێکردووە. بەوورەیەکی بەرز و دلێکی پڕ ئومێدەوە داوات لێ دەکەم کە لێم خۆشبی، زۆر چاک دەزانم ئەگەر تەمەن باقی بێت تا لەم گەشتەمدا ئەوەی بەدوایدا دەگەڕام و ئازاری زۆرم بۆ چەشت دلنیام لەم سەفەرەمدا دەستم دەکەوێت، بۆیە وا بڕیارم دا خۆم کۆبکەمەوە و لەگەل کاروانی تەوبەکاران دا بەرەو بارەگای تۆ منیش بە درووشمی «پەشیمانم ئەی خودایا منیش گەڕامەوە بۆلات «بکەومە ڕێ، ئیتر کۆتاییم پێ هێنا ژیانی پڕ تاوان و ئازار و چەرمەسەری لە پێناوی هیچدا.



# ئەی کچە شیرینەکەم

خۆزگە ئەگەر گورگ تەنها گۆشتی لە مەڕ ئەوی ئەوە پیاو زۆر لە گۆشت گرانتر و گرنگترینیان لە تۆ دەوێ، بەنرخترین شتیان دەوێ کە ئابڕووە

ئەو ئابڕووەی: قورسی تۆی پێوە بەستراوە. ئەو ئابڕووەی: لە ناو خەڵکی شانازی پێوە دەکەیت. ئەو ئابڕووەی: بردنی گەلێک لە مردن گرانترە.

کچە شیرینەکەم:

بڕوا بەو گەنجە مەکە کە ئەڵێ تۆم تەنیا لە بەر ڕەوشت بەرزی و سەنگینی خۆش دەوێت چونکە ووشەی خۆشەویستیان کردۆتە داو و هەزاران کەو و نێچیری وەک تۆی پێ ڕاو دەکەن.

ئاخ ڕۆڵە گیان

خوزگە ئەو گەنجەی پەیوەندی لەگەڵ دەبەستیت کاتێک لەگەڵ کۆمەڵێک هەرزەکاری وەک خۆی دائەنیشێت و باسی ئێوەی کچان ئەکەن ئەو کاتە ئەتزانی هەموو زەردە خەنەیەکی هەرزەکارانە بۆ تۆ ژار و دەردێکی گرانە و هەرگیز بە زەردەخەن وەڵامت نە ئەدایەوە و شلیت بۆ نە ئەنواند.

کچم:

ئەوانەی داوای یەکسانی ژن و مێرد ئەکەن درۆ ئەکەن چونکە بە دروشمی یەکسانی ئەیانەوێ شوێنە هەست بزوێنەکانی کۆمەڵی ئافرەتان دەر بخەن و خۆیان و چاوی زەق و چنۆکیان تێ بەردەن

ئەی کچە شیرینەکەم:

بۆچی ئێوە ئێوارەی ڕابردووی پڕ شانازی خۆتان لە مێژووی ئیسلامدا لە یاد چۆتەوە کە مێژووی ئیسلامی زێڕین قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتین، ئێوەی ئافرەتان یەکەم کەس بوون باوەڕتان هێنا بە ئیسلام، بەر لە ئێوە ئافرەتان یەکەم کەس بوون سەری بەندایەتیان بۆ خوا داناو نوێژتان کرد پێش پیاو، لە هەموو شتێک گرنگتر و جێگای شانازی هەموو ئافرەتێکی بە شەرەفە لە سەرانسەری مێژووی کۆن و تازە و داهاتوودا ئەوەیە یەکەمی شەهیدان و کاروانی شەهیدانی بێ شوماری ئیسلام ئافرەت بوو پێش پیاو.

کچە شیرینەکەم:

ئەمە بوو ئامۆژگارییەکانم بۆ تۆ، هەر ئەمەش ڕاستە بۆ تۆ کە لە منت بیست. زۆر چاک بزانە هەموو چاکیەک بە دەست تۆیە بە دەست پیاو نییە، ئەگەر ئارەزووت کرد خۆت چاک بکە هەموو شتێک چاک ئەبێت، شەرەف و نەتەوەکەشت لە هەموو تەپ و تۆز و تانە و تەشەرێک ئەسڕیتەوە.



# له كۆتاییدا

ئەی خوشكە سەنگینەكەم ووتەی كۆتاییم تەنها ئەوەیە بۆت:

هیوام وایە و داواكارم لە پەروەردگار ئەم پەیڤانەت بۆ بكاتە هۆكاری ڕێنمونی و گەڕانەوە بۆ ڕێی ڕاست و دروست، وە پێشت دەڵێم: توخوا ئەگەر بڕیاری حیجاب و باڵاپۆشیت دا با باڵاپۆشییەك بێت كە خواگیان دەیەوێت، با هەموو مەرجەكانی باڵاپۆشی تێدابێت، چونكە بە هەموو مەرجەكانەوە ئینجا بە باڵاپۆشی دادەنرێت. وە هەروەها ئەگەر حیجابێكی تەواویشت پۆشی، چۆن پۆشاكەكەت لەسەر دەستووری ئیسلامە، با ڕەوشت و ڕەفتاریشت، مامەڵە و هەڵسوكەوتیشت لەسەر دەستووری ئیسلام بێت چونكە هەموو فەرزەكان هەر لە (نوێژو ڕۆژوو و حەج و زەكات و حیجاب) فەرزن لەسەر مسوڵمان بەلام لەوان فەرزتر و پێویستتر و گرنگتر كار پێكردنیانە، ئیتر ماڵئاواو لە دوعای خەیرت بێبەشم مەكە.

سوپاسی پەروەردگار دەكەم كە شەرەفی نووسین و

ئامادەکردنی ئەم نامیلکەیەی وەکو دیارییەک بە من بەخشی، هەزاران هەزار حەمد و سەنا و ستایش بۆ پەروەردگار.

خوێنەری بەڕێز .....

ئەم نووسراوەی لە بەردەستت دایە مشتێکە لە خەرمانێک، بەڵکو قومێکە لە دەریایەک دەربارەی پلە و پایەی (باڵاپۆشی) دەخوازم مایەی ڕەزامەندی خوا و پاشانیش سوود لێ وەرگرتن بێت.

چاککردنەوەی هەڵەو سڕینەوەی پەڵەو پینەکردنی شڕە و ئامۆژگاری و زانیاری زیاتر دڵخۆش و شادومانم دەکات، بەوپەڕی شانازییەوە لە پێشوازی دا دەبم و بەدەست وەری دەگرم و بەچاو دەیبینم و بە گوێ گوێی بۆ دەگرم و بە دڵیش پێی ڕازی دەبم و هەمووی‌یان دەخوێنمەوە و لە شوێنی گونجاوی خۆیان دا دایان دەنێم.

ئازیزەکانم .... لەم نووسراوە دا هەرچی ڕاست و دروست و بێ لەکەیە ئەوە گومانت نەبێت لە خواوەیە، ئەوەی هەڵە و کەموکوڕیشە لە منی بەندەی بێتوانا و بچوکەوەیە.

بۆ ڕەخنە جوانەکانتان و پێشنیازە بە پێزەکانتان یاخود هەر کارێکی باش کە پەیوەندی بەم نووسراوەوە هەیە تا لەچاپەکانی داهاتوو دا سوودی لێ وەربگرین دەتوانن پەیوەندی بکەن بەم ناونیشانەوە

مۆبایل و ئیمەیلی نوسەر

٠٧٥٠١٠٥٣٩٨٧

Masrur.dukany@gmail.com

مەسرورسلێمان عەزیز

٢٠١٠/١/٢٦ ز بەرامبەر ١٨ زالقعده ١٤٣١

وَصَلي للهُ على محمد وَعَلى آلِهِ واصَحبِهِ وَسَلِمِ سُبحانَكَ اللهُم وَبِحَمدِك أشهَدُ أن لاإلهَ إلا أنتَ أستغفِروكَ وَأتوب إليكَ، وسلام عليكمُ وَرَحمةَ اللهِ وَبَرَكاتُهُ.





# سەرچاوەکان


١.القران الكريم.

٢ . ئەسرینەکانی تەوبەکارێک _د.إبراهیم دوەیش _ وەرگێرانی: ڕێباز خورشید، چاپی یەکەم ٢٠٠٧ .

٣. ئەی کچە شیرینەکەم _علی تەنتاوی _ وەرگێرانی محمد مەلا صالح شارەزووری

٤ . باڵاپۆشی ئافرەتی موسوڵمان - نەوا محمد سعید، چاپی یەکەم ٢٠٠٥.

٥ . باڵاپۆشی - عمر خالد ، وەرگێرانی . فاروق عمر محمد ، چاپی سێیەم ٢٠٠٧

٦ . بەرەو ئیسلام ( ئاشتی ) _ ئەندازیار عوسمان، چاپی دووەم ٢٠٠٧ .

٧ . بەرەو ئیسلام ( ئایینێکی جیهانی ) _ ئەندازیار عوسمان، چاپی یەکەم ٢٠٠٩.

٨ . بەڕاستی شاژنە _ د. محمدالعریفی _ وەرگێرانی: عبدالمجید عبدالحمید، چاپی دووەم ٢٠٠٩ .

٩ . بڵاوکراوەی بەختەوەری- دەستەیەک لەخوێنکارانی زانکۆی سلێمانی.

١٠ . بڵاوکراوەی نوێبوونەوە - دەستەیەک لەخوێنکارانی زانکۆی سلێمانی .

١١ . تەفسیری ئاسان ــ بورهان محمد أمین .

١٢ . پەیامەکانی خوشکان زنجیرە(٧) - سودو حیکمەتی باڵاپۆشی_عمر عبدالعزیز، چاپی دووەم ٢٠٠٧ .

١٣ . چەمکێک لەمانای باڵاپۆشی - بەیان نامق محمد .

١٤ . خوانی ڕوح _ مامۆستا أحمدی شەریعە، چاپی دووەم ٢٠٠٨ .

١٥. رۆژئاواییەکان بۆ موسڵمان دەبن _ هالە سەلاحەدین لۆلۆ __ وەرگێڕانی: کەلسومە جەمیل، چاپی یەکەم ٢٠٠٧ .

١٦ . کۆباسێک لەسەر باڵاپۆشی - باوکی محمد - رەزا عبدالكريم، چاپی دووەم ٢٠٠٨ .

١٧ . کۆسپەکانی حیجاب - حسام الدين جودت - وەرگێڕانی: غازی إسماعیل میر ڕۆستەمی، چاپی سێیەم .

١٨ . کچان ئازار و هیوا _ د.إبراهیم دوەیش_ وەرگێڕانی: مەریوان عارف

١٩ .نامیلکەی میوانی کۆتایی گیان کێشان .

٢٠ . وتاری حاجی کاروان.

٢١ . ماڵپەڕی ( عرب توو )

٢٢ . ماڵپەڕی ( کتابات ) .

٢٣ . ماڵپەڕی ( منتديات قيبله ال بن علی )

٢٤ . ماڵپەڕی ( مصريات ) .

٢٥ . ڕۆژنامەی ( نوَّرت )

٢٦ . www.ba8.org

٢٧ . www.haiv.org.

٢٨ . www.Islam Dost.com

٢٩ . wwwislampaik.org



خوشکی بەڕێزم

لەم نامیلەکەدا ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی بالاپۆشی دەخوێنیتەوە.

بە گرنگی بالاپۆشی لە ژیانی خانماندا ئاشنا دەبیت.

وەڵامی ئەو گومان و پرسیارانەت دەستدەکەوێت کە لەم بابەتەدا بە خەیاڵتا دێت.

حیکمەتی بونی بالاپۆشی و مەرجەکانی ڕۆشن دەبێتەوە.

٢٥٠٠ دینار





07501269689
07511408868

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوماریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

ته‌نیاحاجی

Tanya Haji | ته‌نیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن خاتوون " یوسڕا عمر "**

**کراوه به دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

